# نهێنییەکانی

# شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

(١٩٧٩- ١٩٨٢)

## پێشەکیی ئەم چاپە

ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی لەساڵی ٢٠١٤ لەستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید دامەزراوەو ئەرکەکەی کۆکردنەوەو پاراستنی دیکۆمێنتەکانی بزوتنەوەی کوردە لەتەواوی پارچەکانی کوردستاندا. بێگومان کۆکردنەوەی دیکۆمێنتەکان بمانەوێ و نەمانەوێ تێکەڵاو بەکێشە سیاسییەکانی نێوان لایەنەکان دەبێ کەئەمەش ئەو گیروگرفتەی لێ دەکەوێتەوە کە لەوانەیە بەشێك لەو دیکۆمێنتانە لەدژی یەکتری نوسرابن بەڵام بۆ توێژەران بڵاوکردنەوەی ئەو دیکۆمێنتانە زۆر گرنگە چونکە دیکۆمێنت پاڵپشتە بۆ هەر توێژینەوەیەکی ئەکادیمستی. لێرە مەبەست ئەوەیە هیچ لایەنێك وەها تێ نەگات کە بڵاوکردنەوەی فڵانە دیکۆمێنت مەبەستی سیاسیی لەدواوەیەو بۆ بەرزکردنەوەی لایەنێك و دژایەتی کردنی لایەنێکی ترە. گوناهی ئەرشیفخانەی تیا نیە ئەگەر مێژوی سیاسیی کوردستان پڕ ناکۆکی و نەسازان و رقەبەرایەتی بێ. بۆیە دەبێ وەها سەیری ئەو دیکۆمێنتانە بکرێت کەبەشێکن لەرابردومان بەخراپ و باشیەوەو زۆرتر مەبەست لەدوبارە بڵاوکردنەوەیان وەرگرتنی عیبرەتە بۆ ڕێگرتن لە دوبارەبونەوەی بارودۆخێکی نەخوازراو کە کەسمان حەزی نەکردووە ببیینێت .

ئـەو دیکۆمێنتـەی کـەلێرە بـڵاو دەکرێتـەوە نامیلکەیەکـە لەساڵی ١٣٦٠ی ئێرانـی بەرامبـەر بـە ١٩٨١ی زایینـی بـڵاو کراوەتـەوە. حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران دەری کردووە. نوسـەرەکەی دیـار نیـە بـەڵام گومـان هەیـە شـەهید دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆو بەڕێز عەبدوڵڵا حەسەن زادە پێکـەوە نوسـیبێتیان یـاخود دەشـێ یـەکێکیان نوسـیبێتی و هـەروا دەشـێ کەسـێکی تـر بـەڕێنمایی و سەرپەرشـتیی ناوبراوان نوسیبێتی. بەڵام ئەوەی کە بەهیچ جۆرێك مایەی شك و گومـان نیـە ئەوەیـە کەدیکۆمێنتەکـە لەلایـەن دەزگـای ئینتیشـارات و تـەبیلغاتی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حزبـی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە لەرەزبەری ١٣٦٠ دەرچووە .

ناونیشـانی هـەوەڵ چـاپی نامیلکەکـە بەمجۆرەیـە "خیانەتەکانی قیادە مووەقـەت بەرامبـەر بەنەتـەوەی کورد" بـەڵام ئێمـە لەئەرشـیفخانە بەباشـترمان زانـی کەناونیشـانەکەی بگـۆڕین و ناونیشـانێکی وای بـۆ دابنێـین کەخوێنەر هەر لەبەرگەوە درك بەناوەڕۆکەکەی بکات .

نـاواخنی نامیلکەکـە بـۆ گێڕانـەوەی ماجەرایـەك تـەرخان کـراوە کـە٣٥ ساڵی بەسـەرا تێپـەڕیوە. بۆیـە لـەم بەراییـەدا مەسەلەکە پێویستی بەهەندێ رونکردنـەوە و تیشك خستنە سـەر هەیـە. نـاوەڕۆکی نامیلکەکـە بەشـێکە لەشـەڕی راگەیانـدنی نێـوان پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران بـەڵام لـەو کاتـەدا پـارتی زۆرترینـی بـەناوی قیـادە موەقـەت ناسـرابوو. هـەر بـەهۆی

ئەمەشەوە لەنێو نامیلکەکەدا کاتێك ناوی قیادە موەقەت دێتە بەر چاو، مەبەست لێی پارتی دیموکراتی کوردستانە. ئەمە یەك. دوو، بابەتی نامیلکەکە پەیوەندیی بەشەڕی نێوان هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە هەیە. جوگرافیای شەڕەکەش ناو کوردستانی ئێرانە نەك کوردستانی عیراق. سێ، لەو ئان و ساتەدا بارەگای سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەناوچەی مەرگەوەڕ بوو، واتە لەناو خاکی کوردستانی ئێراندا بوو، هاوپەیمانییەك لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و سوپای پاسدارانی ئێران لەدژی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پێك هێنرا بوو و ئەم دوو لایەنە پێکەوە بەهەماهەنگی هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی هێزی پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. لەئەنجامی ئەم هاوپەیمانی و هەماهەنگییەدا حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. هەموو ئەو ناوچانەی لێ سەنرایەوە کە لەساڵی ١٩٧٩ بەدواوە لەژێر کۆنترۆڵیدا بوو .

ئەم نامیلکەیە کەزمانەکەی زۆر زبرەو زۆر بەتوندی تیایدا هێرش کراوەتە سەر سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان، ڕەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییە گرژەیە کە لەو زەمانەدا باڵی بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا کێشا بوو. دەبێ بەچاوی ئەو کاتەوە تەماشا بکرێت. بەڵام نابێ ئەم قسەیە وەها لێك بدرێتەوە کەپاساو هێنانەوەیە بۆ

هەڵوێستێکی خراپ و نانەتەوەیی لەدژی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کەنەدەبوایە لەژێر هەر پاساوو بەهانەیەك پەنای بۆ ببرێت .

بەهەر حاڵ، ئەم مەسەلەیە بۆ مێژوونوسان دەهێڵینەوە کەخۆیان ئازادن چۆن لێی دەڕوانن. کاری ئێمە تەنها رزگارکردنی دیکۆمێنتەکانە لەفەوتان .

**بەناوی**

**سەرپەرشتیارانی پرۆژەی**

**ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی**

## سەرەتا:

لە پەیوەندی نێوان حیزب و رێکخراوە سیاسیەکان دا چ لە نێو خۆی وڵاتێک و چ لە چەند وڵاتی جۆربەجۆردا، هەروەها لە دنیای سیاسەتدا بە گشتی زۆر کارەسات دێنە پێش و زۆر مەسەلە روو دەدەن کە حیزبێکی سیاسی لە هەل و مەرجێکی دیاری کراوی مێژووی دا بەراست نازانێ پەردەیان لەسەر هەڵداتەوە و بیانخاتە بەرچاوی بیروڕای گشتی خەڵکی وڵاتەکەی. هۆیەکەشی ئەوەیە لەو وەختە دیاری کراوەدا بڵاوکرنەوەی مەسەلەکە بە قازانجی گشتیی تێکۆشان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی حیزب و گەل نازانێ،بەڵام بەو مانایە نیە کە ئەو کارەساتە بۆ هەتا هەتایە لە بیر دەبرێتەوەو هیچ کاتێک پەردەیان لەسەر وەلا نادرێ، مەسەلە هەر ئەوەیە کە باسی ئەو رووداوانە هەڵدەگیرێ بۆ هەل و مەرجێکی لەبارتر کە خزمەت بە بەرەوپێش چوونی ئامانجەکان بکا.

ئەوەی لەمەودوا باسی دەکەین شتێکە لەو بابەتە، لەم کورتەباسەدا دەمانەوەێ هەندێ رووداوی مێژوویی بۆ رای گشتی گەلی کورد و گەلانی ناوچە روون بکەینەوە و لەو رێگایەوە هەڵوێستی سەرۆکایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق(قیادە) دەرهەقی بزووتنەوەی میللی

دیموکراتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بەگشتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە تایبەتی بخەینە بەرچاو.

حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەو بڕوایەدا نەبوو کەلە هەل و مەرجی ئێستادا ئەو مەسەلانە بێنێتە گۆڕێ و لێیان بکۆڵێتەوە، بەڵام کردەوەی دژی گەلی سەرۆکایەتی پارتی(قیادە) و نووسراوەکانی ئەم دواییەی بەرێوەبەرانی کە هەوڵ دەدەن ڕووداوەکان بەپێچەوانە بخەنە بەرچاوی خەڵکی کوردستان و بە قازانجی خۆیان راستی یەکان بەراوەژوو نیشان بدەن ناچاری کردین ڕووداوە مێژوویییەکانی پازدە بیست ساڵی رابردوو هەڵوێست و سیاسەتی سەرۆکایەتی پارتی بەرامبەر بەگەلی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەو جۆرە کە بووە و هەیە بخەینە بەرچاوی کۆمەلانی تێکۆشەری خەڵکی کوردستان بۆ ئەوەی بۆ خۆیان ببنە قازی و حوکم بدەن.

شتێکی زیاتریش کە ئێمەی هێنایە سەر نووسینی ئەم کورتە باسە ئەوەیە کە سەرۆکایەتی پارتی لە دوو ساڵی رابردوودا هەمیشە لە خۆپاراستنی حیزبی ئێمەی کەڵکی خراپی وەرگرتووە و بێدەنگی ئێمەی لەسەر سیاسەتی دژی گەلی و کردەوەی تاوانبارانە و گومان لێکراوی خۆی بەنیشانەی کزی و بێ هێزی حیزبی ئێمە و بزووتنەوەی میللی دیموکراتیکی گەلی کورد و کورستانی ئێران

زانیـــوە. هەروەک هاونیشـتمانانە بەریزەکـان ئاگـادارن سـەرۆکایەتی پارتی بیشـەرمی گەیانـدوەتە رادەیەک کە بۆ داپۆشینی خیانەتەکانی خۆی درۆ و بوختان بۆ حیزبی ئێمە هەڵدەبەستێ و روخساری دزێـو و بەکرێگیـراوانەی خۆی لە ئـێمە دادەبینـێ، لەوەش زیـاتر لەم دوایـیـانەدا شان بە شـانی جاش و ئەرتەش و پاسدار و هەموو هێزە سەرکوت کەرەکـانی ریژێمـی کۆنەپەرستی خـومەینی لەشکری بۆ سەر خاکی کوردستان کێشاوە و شارو گوندی کوردسـتانی ئێـران پەلامـاردەدا. هەربـۆیە بەرێـوەبەرایەتی حیزبـی ئـێمە گەیشـتە ئەو بـروایەی کە بێـدەنگ بـوون لە راسـت خیـانەت و جینایەتەکانی ئەو تاقمە بەکرێگیراوو چڵکاو خۆرە لەوە زیـاتر درووست نیە و پێویستە واقیعەتی رووداوەکان لە کۆنەوە تا ئەمرۆ بە ئاشکرایی بێ پەردە بخرێتە بەردەم کۆمەلانی زەحمەتکێشی خەڵکی کوردستان و سەرانسەری ئێران.

# هەڵوێستی خەڵکی کوردستانی ئێران
# بەرامبەر بزووتنەوەی کوردستانی عێراق
# بەسەرۆکایەتیی بارزانی

پاش سەرکەوتنی شۆرشی چاردەی ژووئیەی ساڵی ١٩٥٨ ی عێراق دەرفەتێکی مێژوویی بۆ گەلی کورد لە کوردستانی عێراق هاتە پێش تا بتوانێ مافە نەتەوایەتییەکانی خۆی بەشێوەی خودموختاری لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا وەربگرێ، بەدوای سەرکەوتنی شۆرش ئازادیە دیموکراتیەکان تارادەیەکی زۆر لە عێراق دا جێگیر بوون، پارتی دیموکراتی کوردستان کە تا ئەو دەم بەنهێنی خەباتی دەکرد، دەستی بە تێکۆشانی ئاشکرا کرد، زوو رۆژنامە و گۆڤاری کوردی بە رەسمی و بە ئاشکرا بڵاو بوونەوە کە یەکیان (خەبات)ی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێرق بوو، بارزانی یەکان کە ١٣ ساڵ بوو لە یەکێتی شورەوی دا دەژیان گەرانەوە وڵات و دروشمی برایەتی کورد و عەرەب لە عێراق دا وەک واقعیەتیک خۆی نواند.

حکوومەتی (عبدالکریم قاسم) لەسەرەتاوە زۆر هەنگاوی بەکەڵک و شۆرش گێرانەی بە قازانجی خەڵکی عێراق و چینە زەحمەتکێشەکان هەڵینایەوە کە یەکێک لەوانە مەسەلەی دابەشکردنی زەوی و زار بوو، بەڵام بەرە بەرە (قاسم) لەپەرەگرتنی بزووتنەوەی نیشتمانی خەڵکی عێراق ترساو لەلایەکیش هێزە دیموکراتی و نیشتمانی یەکانی عێراق نەیانتوانی لە گۆڕانی سیستمی

سیاسی عێراق قازانجی دوارۆژی خەڵکی وڵاتەکەیان کەڵک وەربگرن، لەئاکام دا رۆژ بەرۆژ ئازادییە دیموکراتییەکان بەرتەسک کرانەوە و زەمینە بۆ تێکچونی وەزعی سیاسی لە عێراق دا ئامادە بوو. ساڵی ١٩٦١ هیندێک لە دەرەبەگەکانی کوردستانی عێراق کە لە بەرنامەی ئیسلاحی ئەرزی ڕیژێمی (عبدالکریم قاسم) نارازی بوون دەستیان دایە چەک و چوونە شاخی، پاش ماوەیەک پارتی دیموکراتی کوردستان سەرۆکایەتی بزووتنەوە چەکدارییەکەی گرتە دەستی خۆی درووشمی نەتەوایەتی خودموختاری بۆ کوردستان هەڵگرت. لەو تاریخەوە واتە لە سپتامبری ١٩٦١ وە بزووتنەوەکە شکڵێکی نەتەوایەتی بەخۆیەوە گرت و بەرە بەرە چین و توێژەکانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق لە دەوری خۆی کۆ کردەوە.

لە ١١ ی سپتامبری ١٩٦١ تا شەشی مارسی ١٩٧٥ واتە ماوەی چواردە ساڵ بزووتنەوەی کوردستانی عێراق بەزۆر قۆناخی جۆر بەجۆر دا تێ پەریوە کە بەداخەوە ئەنجامەکەی تێکچوون و تێ شکانێکی بێ وێنە بوو کە لە مێژووی گەلی کوردا بە(ئاش بەتاڵ) ناوبانگی دەرکردوە، ئێمە نامانەوێ بەوردی بچینە نێو ئەو باسەوە کە هۆی ئەو شکستە گەورەیە چی بووە و بزوتنەوەیەک کە بە قسەی سەرکردایەتیی پارتی خاوەن سەد هەزار پێشمەرگە بوو چۆن و لەبەر چی لە ماوەی چەند ڕۆژ دا

ئاداری بەسەر پادارییەوە نەما، ئەو باسە پێویستی بەوەخت و دەرەتانێکی زۆرتر هەیە و لە کورتە باسدا جێگای نابێتەو، تەنیا شتێک کە دەمانەوێ قامکی لەسەر دانێین مەسئولیەتی سەرۆکایەتی پارتی لەو ئاش بەتاڵەیە ئاش بەتاڵێک کە بەقیمەتی کوژران و ئیعدامی سەدان کەس و ئاوارە بوونی سەدان هەزار کەس لە برا کوردەکانی عێراقمان تەواو بوو، جگە لەوەش بزووتنەوەی گەلی کوردی لە کوردستانی عێراق دەیان ساڵ وەدواخست، ئەو راستی یە بۆیە وەبیر دەخەینەوە چونکە سەرۆکایەتی پارتی تا ئێستاش نەک هەر خۆی لەو شکستە گەورەیە بە مەسئوول نازانێ ، بەڵکو خۆی وەک قارەمانێک نیشان دەدا و ئاکار و کردەوەی بە شێوەیەکە کە هەروا بزانە گەلی کورد شتێکیش بە سەرۆکایەتی پارتی و بنەماڵەی بارزانی قەرزارە.
ئێمە لە باسی رووداوەکانی بیست ساڵی رابردوودا وردە وردە ئاکار و کردەوەکانی سەرۆکایەتی پارتی وەک سەرکردەی بزووتنەوەی ١٩٦١ی کوردستانی عێراق و بەتایبەتی رەفتاری بنەماڵەی بارزانی روون دەکەینەوە و لەو رێگایەوە گۆشەیەک لە هۆیەکانی ئەو ئاش بەتاڵە مێژووییە و مەسئولیەتی سەرۆکایەتی پارتی لەو شکستە گەورەیە نیشان دەدەین، بەڵام ئەوەی زیاتر مەبەستی ئێمەیە روونکردنەوەی هەڵوێستی گەلی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی

کوردی عێراق و سیاسەتی سەرۆکایەتی پارتی دەرهەق بە تێکۆشەرانی گەلی کورد و حیزبی دیموکراتی ئێرانە.

هەر لە سەرتای دەست پێکردنی بزوتنەوەی ساڵی ۱۹٦۱ ی گەلی کورد لە کوردستانی عێراقەوە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەشێکی زۆر لە کار و تێکۆشانی خۆی بو پشتگیری و یارمەتی ئەو بزوتنەوەیە وەکار خست، خەڵکی کوردستان ئێرانی بە هیوا و هومێدێکی زۆرەوە چاویان بڕیبوە بزوتنەوەی گەلەکەمان لە کوردستانی عێراق و بە ئیمان و بەو راستییە کە وەدەست هێنانی مافە رەواکانی گەلی کورد لەهەر بەشێکی کوردستان دا دەتوانێ ببێتە نموونە بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستانیش هەرچی لە توانایان دابوو لە یارمەتی ماددی و مەعنەوەی بێدرێغ پێشکەشی ئەو بزوتنەوەیان کرد.

کادر و مەسئوولانی حیزبی ئێمە چ ئەوانەی لە نێو خۆی وڵات دا بە نهێنی تێدەکۆشان و چ ئەوانەشی کە ئاوارەی کوردستانی عێراق ببون قورسایی کاری خۆیان خستبوە سەر تێکۆشان بۆ ناساندن و یارمەتی دانی بزوتنەوەی گەلەکەمان لە کوردستانی عێراق. کادرەکانی ئێمە کە لە کوردستانی عێراقی ئەو دیو دەژیان دەستە دەستە بە نهێنی دەگەڕانەوە کوردستانی ئێران و بە کۆمەکی ڕێکخراوەکانی حیزبی چەک و پووڵ و تەقەمەنی و خواردەمەنی و بەرگ و پێڵاویان کۆ دەکردەوە و

دەیانگەیاندە براکانیان لە کوردستانی عێراق ، پێویستە ئەوەش بگوترێ کە زۆربەی ئەو یارمەتی یانەی کۆدەکرانەوە و بەرێ دەکران راستەوخۆ دەگەیشتنە دەستی بارزانی.

خەڵکی کوردستانی ئێران باشیان لەبیرە کە لە ژێر زەبروزەنگی ساواک دا، ئەندامانی حیزبی ئێمە یارمەتییان بۆ بزوتنەوەی کوردستانی عێراق کۆدەکردەوە و زستانان کەبەفر رێگاکانی دەگرت و ولاّغ دەرنەدەچوو، ئەو خەڵکە بەشەرەفە پشتێنێک بەفریان دەدری و بە کۆڵ کۆمەکەکانی خۆیان ئاوای ئەو دیو دەکرد. خۆ لە جەبهەکانی شەریش دا ئەندامان و لایەنگران و کادر و مەسئولەکانی حیزبی هیچ کاتێک خۆیان لە برا پێشمەرگە عێراقی یەکانیان هەڵناوارد و هەمیشە شان بە شانی ئەوان لە چیا و پێدەشتەکانی کوردستان دا سنگیان بە گولەوە نا، چیاکانی هەندرین و زۆزک و بەشی بادینان و ناوچەی پشدەر و پێنجوێن و بە کورتی هەموو جەبهەکانی شەری کوردستانی عێراق شاهیدی گیانبازی پێشمەرگە کوردە ئێرانیەکانن کە بەچەک و فیشەک و هەموو ئیمکاناتی خۆیان لە ژێر سەرکردایەتی برا کوردەکانی ئەو دیودا شەریان دەکرد و تەنانەت چاویان لەوە نەبوو جارێکیش ناویان ببرێ.

با ئەوەش بڵێین ڕەفتاری بارزانی و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردستانی عێراق لە سەرتاوە تا ئەو وەختە کە زۆرتر تەکیەی لەسەر یارمەتی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بوو لەگەڵ براکانی ئاوارەی ئێمە و هەروەها لەگەڵ حیزبی ئێمە دۆستانە بوو، بەڵام وردە وردە حکوومەتی حەمە ڕەزاشا و دەزگای جاسوسی ساواک دەستیان کێشایە نێو بزوتنەوە و لەگەڵ سەرۆکایەتی کەوتنە تەون و بەست، پێ بە پێی لێک نزیک بوونەوەی ڕیژێمی شا و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردستانی عێراق ڕەفتار و هەڵوێستی سەرۆکایەتی بارزانی بەرامبەر بە حیزبی ئێمە خراپ و خراپتر دبوو، هەتا دەزگای جاسوسی ساواک زیاتر خۆی لە بارەگای بارزانی نیزیک دەکردەوە مەیدانی کارو تێکۆشانی کادر و ئەندامانی حیزبی ئێمە بەرتەسکتر دەکرا.

سەرە بەهاری ساڵ ١٣٤٤ ئەفسەری بەناوبانگی روکنی دووی ئەرتەش سەرهەنگ مودەرریسی لە ناوچەی سەنگەسەر کە ئەو کاتە ناوەندی سەرکردایەتی بزوتنەوە بوو جێگیر بوو، بەگەیشتنی سەرهەنگ مودەرریسی بۆ ئێمە تەکلیفی براکانی ئێمە روون بوو. سەرۆکایەتی بارزانی کە نەدەکرا لە فەرمانی ساواک و روکنی دووی ئەرتەشی ئێران سەرپێچی بکا بەرەسمی نوێنەرانی حیزبی ئێمەی بانگ کرد و پێی ڕاگەیاندن کە دەبێ بنکەکانیان لە نزیک سنووری ئێران تێک دەن و بە هیچ

جـۆرێکیش هـاتوچۆی کوردسـتانی ئێـران نەکەن، لەوەش زیاتر رۆیشت و داوای کرد کە هەموو چەشنە تێکۆشانێکی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان لـە نێـو خـۆی وڵاتـیش دا رابگیـرێ، بەدوای ئەو فەرمـانـە مێـژووییەدا ئەفـرادی بارزانی بۆ خۆیان پەلاماری بنکەکانی کوردی ئێران لە نزیـک سنووریان دا و تێکیانەوە پێچـان و بـۆ ئەوەی کە براکانی ئێمە نەتوانن بەیاننامە و نووسراوەی حیزبـی بڵاوبـــکەنەوە هەمـــوو کەرەســـتەی چـــاپەمەنی و کتێبخانەکەشیان بەتاڵان برد.

لێـرەدا بـوو کە سـەرۆکایەتی بـارزانی یـارمەتی دەوڵەتـــی کۆنەپەرســـت و و نـــۆکەری ئیمپریـــالیزمی حەمەرزاشای لە جێگای یارمەتی خەڵکی کوردستان دانـا، رووی کـردە دوژمنـانی گەلـی کـورد و پشـتی لە کـۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کرد، لە راستی دا بەردی بناخەی ئـاش بەتـاڵ سـاڵی ١٩٧٥ی بـارزانیش لێـرەدا دانـراوە و تـا ئێستاش کە ئێستایە گەلی کورد لە کوردستانی عێراق و تەنانەت لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش دا کوتەکی ئەو لاری بوونەی سەرۆکایەتی بارزانی وێدەکەوێ.

بـۆ حەقـیقەت و تـاریخ دەبـێ بگـوترێ کە کـۆمەڵانی بەشـەرەفی خەڵکـی کوردسـتانی عێـراق و ئەنـدامان و پێشمەرگەکانی پارتی و تەنانەت بەشێکی زۆر لە کادری بەرێوەبەرایەتی پارتیش دژی ئەو سیاسەتە بـوون، بەڵام بەرامبەر بە دیکتـاتۆری و سـەرەڕۆیی بنەماڵەی بـارزانی

کارێکیان لەدەست نەدەهات، ئەوان کە دەیانزانی ئەوەی بەراستی دۆستی بزوتنەوەی کوردستانی عێراقە گەلی کوردی ئێرانە نەک حکوومەتی حەمە رەزاشا. بەدزی دوور لە چاوی دەزگای جاسوسی بارەگای بارزانی هەمیشە دۆستایەتی تێکۆشەرانی کوردی ئێرانیان دەکرد و دڵخۆشییان دەدانەوە بەڕاستی زۆر کوردی بەشەرەفی عێراقیش هەر بە تاوانی دۆستایەتی براکانی ئێمە کەوتنە بەر لافاوی ڕق و قینی بارزانیەکان و تووشی ئەشکەنجە و و زیندان و ئازار و جەزرەبە بوون.

هەر لە سەرەتاوە دیار بوو دواییش بە بەڵگە دەرکەوت کە شەرتی هەرە بنەڕەتی یارمەتی ڕیژێمی حەمەڕەزاشا بەسەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردستانی عێراق ئەوە بووە کە ئەو سەرکردایەتی یە ڕێگا نەدا هیچ چەشنە بزوتنەوەیەکی دژی ڕیژێمی کۆنەپەرست و نۆکەری ئیمپریالیزم لە کوردستانی ئێران سەر هەڵبدا و گوڵ بکا.

پیاو هەق بڵێ دەربارەی بارزانی زۆر بە سەرراستی ئەو بەڵێنەی بەجێ گەیاند و هیچ کاتێک نەیهێشت دەرباری پەهلەوی لەو بارەوە گلەیی بکا. ڕووداوەکانی دواتر کە لەمەودوا باسیان دەکەین باشی نیشان دەدەن کە بارزانیی بێ قەول و قەرار لەگەڵ گەلی کورد تا چ رادەیەک بەو بەڵێنەی بە دووژمنانی کوردی دابوو هەتا سەر وەفادار مایەوە.

بەهاری ساڵی ١٣٤٦ ئیدریس بارزانی لە ڕێگای بێ سیمەوە دەستوری بە(عەلی شەعبان) بارزانیی فەرماندەی پێشمەرگە لە ناوچەی بیتوین دا کە بچێتە سەر بنکەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە گوندی(دێرێ) و هەموو هاورێیانی بگرێ، بەڵام پێش ئەوەی عەلی شەعبان بتوانێ ئەو فەرمانە جێ بەجێ بکا، بە هۆی کوردێکی بەشەرەفەوە خەبەرەکە بە براکانی ئێمە گەیشت، شەهید کاک سولیمانی موعینی و هاورێ کانی کاتێک ئەو خەبەرەیان زانی تێگەیشتن کە لە کوردستانی عێراق گیانیان لە مەترسی دایە و جێ پێ یەک بۆ خەباتکەرانی کوردی ئێران لە کوردستانی عێراق نەماوە، بۆیە هەر زوو راپەرین و خۆیان گەیاندە کوردستانی ئێران.

بەدوای ئەوان دا دەستە دەستە کادرو ئەندامانی ئاوارەی حیزبی دیموکراتی کوردستان گەرانەوە ئێران و لە هەل و مەرجێکی زۆر دژوار و پڕ لە زەبروزەنگی پۆلیسی دا تێکۆشانی سیاسی خۆیان دەست پێکرد، دیارە رێژیمی حەمەڕەزاشا نەیدەتوانی تێکۆشانێکی وا بەربڵاوی حیزبی ئێمە تەحەمول بکا و هەر بۆیە هەزاران جاش و ژاندارمی بۆ راونانی خەباتکەرانی حیزب خستە کار. لە ئەنجام دا هاورێیانی ئێمە جگە لەوەی کە چەکدارانە و دیفاع لە خۆیان بکەن ڕێگایەکیان بۆ نەمایەوە و بەو جۆرە ڕاپەڕینی چەکدارانە

ساڵەکانی ١٣٤٦-١٣٤٧ کە بەشێکی زۆری ئەنجامی سیاسەتی دژی کوردی سەرۆکایەتی بارزانی بوو بێ وەخت و بێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادە کرابێ. دەستی پێکرد.

هەرچەندە راپەرینەکە خۆی بۆ ساز نەکرابوو بە چەشنێکی گشتی هەل و مەرج لە ئێران دا بو راپەرینێکی چەکدارانە ئامادە بوو. لەبەر ئەوەی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی خەڵکی کوردستان بە گەرمی باوەشیان بۆ پێشمەرگەکانی حیزبی کردەوە و پشتیوانی لێ کردن، ئەو راپەرینە ١٨ مانگ خۆی راگرت و دەردە سەرێکی زۆری بۆ ریژێمی بەکرێگیراوی پەهلەوی پێک هێنا. حکوومەتی ئیستیبدادی پەهلەوی کاتێک تێگەیشت بەو هەموو جاش و ژاندارمەوە ناتوانن بزوتنەوەی چەکدارانە سەرکوت بکا هاواری بۆ بارزانی برد و داوای لێ کرد کە بەپێی تەعەهودێک کە داوێتی بۆ سەرکوت کردن و کوژاندنەوەی ئاگری ئەو راپەرینە یارمەتی بدا، لێرەش دا دەربارى بارزانی پیاوانە فریای دەرباری پەهلەوی کەوت و بە دڵسۆزیەوە!! بە هاواری گەیشت.

کۆمەکی بارزانی بە حکوومەتی حەمە رەزا شا دوو باری هەبوو: یەکیان ئەوە کە ئەفرادی چەکداری خۆی بۆ یارمەتی هێزە سەرکوتکەرەکانی شا ناردە کوردستانی ئێران و ئەوی دیکەش ئەوە کە لەداخلی کوردستانی عێراق دا کەوتە گرتن و راونان و تەحویل دانەوەی تێکۆشەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کرا بە

زیندوویی دەنا بە مردوویی.

خەڵکی ناوچەکانی پیرانشار و سەردەشت و بانە شاهیدن کە چەکدارەکانی بارزانی چۆن لە نێو جەرگی کوردستانی ئێران دا شان بە شانی ئەندام و جاشەکان و بە دوای پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دا دەگەران. (مام وسوو دزەیی) فەرماندەی بەشێک لەو چەکدارانەی هاتبوونە کوردستانی ئێران پاش چەند رۆژ مانەوە و گەران لە کوردستانی ئێران دا گەرایەوە بۆ عێراق. لەوی بە ئاشکرا گوتبوی: من ئیتر ناتوانم ئەو خیانەتە بکەم. بە تەواوی هەستم کردوە خەڵکی کوردستانی ئێران بە جاشمان دەزانێ و لە راستیش دا جاشین. هەر لە سەر ئەوەش (حەسۆ میرخانی بارزانی) فەرماندەی هێزی کاوە لە ناوچەی قەڵادزی رقی لێ داگرت و هەتا دوای ئاش بەتاڵیش ناکۆکی نێوان ئەو دوو کەسە کۆتایی نەهات.

لە کوردستانی عێراقیش دەزگای دژی گەلی دارودەستەی بارزانی کەوتە گرتن و راونانی ئەو کادر و مەسئولانەی حیزبی ئێمە کە لە کوردستانی عیراقدا مابوونەوە. یەکەم قوربانی ئەو هێرشە دژی گەلی و ناپیاوانەیە هاوریی شەهید(مەلا رەحیمی وێردی) خەڵکی مەنیجەلانی بانە و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو. کاک رەحیم کە بە(میرزا ئەحمەد) ناسرا لە گوندی(سورە دزە) لە ناوچەی

مـــــــاوەتی کوردســـــــتانی عێـــــــراق دەژیـــــــا. چەکدراەکانی(عەبـدوالوەهاب ئەترووشـی) بەکرێگیـراوی ساواک و فەرماندەی ئەو کاتی هێزی خەبـات چـوونە سەری گرتیان و بەرەو سنووری ئێران لەگەڵ خۆیان برد. لە رێگا زۆر بێ شەرمانە شەهیدیان کرد و تەرمی بێ گیانی ئەو رۆڵە تێکۆشەرەیان وەک دیارییەکی بچوک تەسلیمی ریژێمی چەپەڵی حەمە رەزاشا کردەوە.

بێجگە لە میرزا ئەحمەد چوار کەسی دیکەش لە ئەندامان و پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەر لەلایەن عەبدوالوەهاب ئەترووشییەوە گیران و بەزیندویی تەسلیمی ئێران کرانەوە کە دوای چەندین ساڵ زیندان ئازاد بوون. ئەو چوار کەسە خەڵکی ناوچەی هەورامان و جوانرۆ بوون. ساڵی١٣٤٨ یش هەر ئەو جەنابی ئەترووشی یە شەهید کاک(هاشمی حەق تەلەب) مەشهور بە قادر شەریفی لە یەکێک لە مزگەوتەکانی شاری سلێمانی دا تیرۆر کرد زۆر بەشانازییەوە خەبەری ئەو شاکارەی بە بێ سیم بە بارەگای بارزانی راگەیاند. پیاو لە حەق دەرنەچی پاش بەیاننامەی ١١مارسی ١٩٧٠ کاتێک (عەبدوالوەهاب ئەترووشی) کرابوو بە ئوستانداری هەولێر یەکێک لە نوێنەرانی حیزبی ئێمە لەگەڵ چەند کوردێکی دڵسۆزی عێراق چووبوونە لای و ئەو تاوانەیان بەچاودا دابوو. ناوبراو نامەی رەسمی بارەگای بارزانی نیشان دابوو کە دەستووری گرتن و تەحویل دانەوەی

میرزا ئەحمەدی پێ دابوو.
لە بەهاری ساڵی ١٣٤٧ دا کە هێشتا بزوتنەوەی چەکدرانەی کوردستانی ئێران درێژەی هەبووە شەهید سولەیمانی موعینی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە گەڵ برایەکی کادر بە ناوی (خەلیلی مستەفازادە) ناسراو بە(خەلیل شەوباش) بە نهێنی چووە شاری سولەیمانی تا لە رێگای حیزبی کۆمۆنیستی عێراقەوە لەگەڵ هێندێ مەسئوولی حیزبی کە لە ئەوروپا دەژیان پەیوەندی بگرێ، ئەو سەفەرە کەمێک درێژ بووە و لە ئاکام دا ساواک هەستی کرد کاک سولەیمان چوەتە ئەودیو . بۆیە لە گەل سەرۆکایەتی بارزانی دەفکرێ لە دواخستنی سولەیمان کەون. بۆ وەدی هێنانی ئەو ئاواتە چەپەڵە سەرکردایەتی بارزانی بە هۆی سکرتێری پارتی و ئەندامێکی دیکەی کۆمیتەی ناوەندییەوە لە کاک سولەیمان دا دەسپێرێ کە هەوڵ بدا مەسئوول و پێشمەرگەکانی حیزب لە کوردستانی ئێران دا بگێرێتەوە بۆ کوردستانی عێراق جارێ واز لە کوردستانی ئێران بێنن بەو ناوە کە مەسەلەی کورد هەر یەکە و ئێستا کە لە عێراق بزوتنەوە هەیە ناکرێ جەبهەیەکی دیکەش بکەینەوە. بەڵێنیشی پێ دەدەین کە ئەگەر بگەرێتەوە کوردستانی عێراق شەخسی بارزانی زەمانەتی پاراستنی گیان و ئەمنیەتیان دەکا. کاک سولەیمان بەڵێن دەدا کە کاتێک گەیشتەوە

ئێــران مەســەلەکە لەگەڵ هاورێیــانی بــاس بکــا و نەتیجەیان بداتەوە.

لەســـەر ئەو هەوڵ و قەرارە کـــاک ســـولەیمان لە سلێمانییەوە بەرەو کوردستانی ئێران دەگەڕێتەوە. بەڵام لە دەرەوەی شاری سولەیمانی دەکەوێتە بۆسەیەکەوە کە(سەدیق ئەفەندی) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەسئوولی لقی چواری پارتی بە دەستووری سەرکردایەتی بۆی دانابوو. کاک سولەیمان و هاوڕێیەکی بەو فێڵە نامەردانەیە بە بێ چەک گیران و ڕەوانەی حاجی ئۆمەران کران کە ئەو کاتە بارەگای بارزانی لێ بوو. کاتێک شەهید سولەیمان دەبەنە لای بارزانی مەلا مستەفا زۆر جنێوو قسەی کاڵی پێ دەڵێ، بەڵام شەهیدی نەمر کە دەزانێ بارزانی بریاری تەحویل دانەوەی ئەوی داوە بە ئەنقەست و بۆ ئەوەی توورەی بکا بەگژی دادێ و ئەوەی بەزاری دادێ پێی دەڵێ مەبەستیش هەر ئەوە دەبێ کە لەوێ بیکوژن و بەزیندوویی نەدرێتە دەستی ڕیژێمی شا، بارزانی کە قەت هیچ کەس نەیتوانیوە قسەی لە قسە بکا لە دین دەردەچێ و لە یەک جەولە دا دەڵێ:"بیبەن، بیبەن، بیکوژن، سەیە، سەباب".

دیارە ئەو کورتە جوملەیە لە قاموسی بارزانییەکان دا بە مانای موحاکەمە و دادگا و حوکم دان و هەموو شتێکە. ئیتر هەر ئەو شەوە ئەو دوو تێکۆشەرە گوللەباران دەکەن و بۆ بەیانی تەرمەکانیان بۆ مەزەی سەر سفرەی شەرابی

کاربەدەستانی ریژێمی شا دەنێرنەوە ئێران. خەڵکی بەشەرەفی کوردستان بۆ خۆیان دیویانە کە چڵکاو خۆرەکانی ساواک بە چ شێوەیەک و بە چ فیزێکەوە تەرمی بێ گیانی ئەو تێکۆشەرە شەهیدەیان بە شارو بازێرەکان دا دەگێرا و پێویست ناکا ئێمە زیاتری لەسەر برۆین.

کار بەوەندەوە کۆتایی نەهات. ریژێمی شا و داورودەستەی بارزانی پسێکەوە لە هەوڵ و تەقەلای کووژاندنەوەی ئاگری راپەرینی چەکدارنەی کوردستانی ئێران دا بوون. بارزانی لە لایەک چەکدارەکانی خۆی بۆ راونانی تێکۆشەرانی حیزبی ئێمە دەناردە هاواری جاش و ژاندارمەکانی شا و لە لایەکیش لە بنەوە بە ناوی دڵسۆزی لێی رادەسپاردن کە بگەرێنەوە کوردستانی عێراق و دڵنیابن کە مەترسییەک هەرەشە لە ژیانیان ناکا.

لە ١٣٤٧ دا ئەگەر لەولا کاک سولەیمان بەدەستی قولەچوماغەکانی بارزانی شەهید کرا. لەم لاشەوە بە ماوەیەکی زۆر کەم تێکۆشەی بەناوبانگ "مەلا ئاوارە" گیرا و پاش سێ مانگ شەهید کرا.کاک "سمایلی شەریفزادە" لە گەڵ سێ کەس لە هاوسەنگەرەکانی لە ناوچەی بانە کەوتنە داوو شەهید بوون. کاک عەولای موعینی لەگەڵ پێشمەرگەی بەناوودەنگ "مینە شەم" لە نزیک قالوی لە ناوچەی مەهاباد شەهید کران و زۆر

کەسیش لە پێشمەرگەکان لە پێک هەڵپرژان لەگەڵ جاش و ژاندارم دا گیانی خۆیان بەخت کرد.

وەختێک بەشێکی زۆر لە بەرێوەبەرانی بزوتنەوە لە نێو چوون برا پێشمەرگەکان خۆیان بێ دەرەتان و بێ سەرپەرشت هاتە بەرچاو. بۆیە کاتێک حەسۆ میرخانی بارزانی فەرماندەی هێزی کاوە لە ناوچەی پشدەر بە قەولی خۆیان لە سەر شەرەفی بارزانی بەڵێنی پێ دان کە ئەگەر بگەڕێنەوە عێراق گیانیان لە ئەمان دایە، بەو بەڵێنە رازی بوون و چوونەوە کوردستانی عێراق. بەڵام قەولی شەرەفی بارزانییەکان بەو جۆرە وەفای پێ کرا کە جگە لەوەی هەموویان چەک کردن هەر دەس بە جێ لێکیان بڵاو کردن و پاش چەند رۆژێک یازدە کەسیان لێ گرتن و بەبێ سی و دوو لێکردن تەحویلی ئێرانیان دانەوە.

جەللادەکانی ریژێمی شا لەو یازدە کەسە چوار رۆڵەی بە نرخی وەک "سالح لاجانی"و"سولەیمان کەرقەشان"و"عەولای بایزە منجە" و" حەمەسووریان" بێ موحاکەمە گوللەباران کرد و ئەوانی دیکەش بە زیندانی دوور و درێژ مەحکووم کران، گڵکۆی ئەو چوار شەهیدە ئێستاش لە سەر رێگای پیرانشار- نەغەدە شاهیدی نەمری بەکرێگیراوی و خۆفرۆشی بنەماڵەی بارزانی یە.

هاوینی ساڵی ١٣٤٧ هێشتا خوێنی ئەو چوار شەهیدە وشک نەببوە کە دەستی پیاوکوژەکانی بارزانی بە خوێنی دەستەیەکی دیکە لە تێکۆشەرانی ڕێگای ڕزگاری کوردستانی ئێران سوور بوو. دەستەیەک لە پێشمەرگەکان کە لە ناوچەی لاجان مابونەوە لە گەڵ جاش و ژاندارم لێیان دەبێتە شەڕ. دوای چەند سەعات تەقە و لێکدان ناچار دەبن پاشەکشە بکەن بۆ کوردستانی عێراق، ئەو برایانە کە پێنج کەس دەبن لە نزیک سنووری ئێران دەچنە دێیەک بە ناوی"ئالان" ژاندارم و جاشەکان کە بە دووربین پاشەکشەی پێشمەرگەکان بۆ خاکی عێراق دەبینن بە ماشێن دەچنە حاجی ئۆمەران و لەوێ دا لەگەڵ چەند چەکدرای بارزانی بە سەرۆکایەتی"غەزالی میرخانی بارزانی" و"ئەحمەد حاجی و پیاوکوژ و ئەشکەنەچی بە ناوبانگ"سەعید مەسیفی دەچنە سەریان و دێیەکە گەمارۆ دەدەن.

پێشمەرگەکان لە پێشدا کەوا دەزانن هەر جاش و ژاندارمەی ئێران دەوریان داون، دەس نادەن و تەقەیان لێ دەکەن. بەڵام غەزالی کە یەکێک لە نیزیکانی دەرباری بارزانی یە بانگیان دەکا و دەڵێ ئێمە جاش و ژاندارم نین پێشمەرگەی بارزانین، وەرنە دەرێ، لە سەر شەرەفی بارزانی کەس هیچتان لێ ناکا و گیانتان لە ئەمان دایە.

برادەرانی ئیمە بۆ ئەوەی شەریان لە گەل پێشمەرگە نەکردبی سێ کەسیان دێنە دەر کە خۆیان تەسلیم بکەن بەلام هەر لە دەرگای ماڵەکە دێنە دەرێ سەعید مەسیفی تەقەیان لێ دەکا و هەرسێکیان لە خاک و خوێن دەردەدا!! دوو پێشمەرگەکەی دیکە کاتێک وادەبینن خۆیان بەدەستەوە نادەن و هەتا ئاخر گوللە شەریان لەگەڵ دەکەن، بەلام سەرەنجام کە فیشەکیان لێ دەبڕێ دێنە دەری ئەوانیش هەر لەوێ گوللەباران دەکرێن. جەنازەی ئەو پێنج شەهیدە هەر لەوێ دەکەنە دیاری دەستی خۆیان و دەیاندەنە دەستی ژاندارمەکانی شا بۆ ئەوەی بیان هێننەوە ئێران.

ئەوانەی باسمان کردن تەنیا بەشێک لەو تاوانانە بوون کە سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کوردستانی عێراق لە ساڵەکانی پیش ۱۹۷۰ دا لەگەڵ تێکۆشەرانی کوردی ئێرانیان کردوە. ئەگەر بمانەوی هەموو شتێک باس بکەین دەبی سەدان لاپەرەی لەسەر بنوسین، بەلام وەک دەڵێن مستێک نمونەی خەلوارێکە.

ساڵی ۱۳٤۸کۆنفرانسی دووهەمی حیزبی ئێمە پێک هات.

کۆمیتەی ناوەندی حیزب بە ناوی کۆنفرانسەوە یادداشتێکی دا بە پارتی و بارزانی و لەوێ دا نارەزایی خۆی لەو کردەوە نارەوایانە دەربری. دیارە ئەوان پاش ماوەیەک کۆمیتەی ناوەندی حیزبی ئێمە بۆ باسی

هێندێک مەسەلە دەستەیەکی نوێنەرایەتی ناردە لای مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

راستە کە دەڵێن بنیادەم کوێرزەینە. ئەوانەی لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی ئێمە قسەیان کردبوو بریتی بوون لە "حەبیب محمد کەریم"سکرتێری ئەوکاتی پارتی و"عەلی عەبدوڵڵا" سکرتێری ئیستای پارتی. کاتێک نوێنەرانی حیزبی ئێمە باسی ئەو کارەساتەیان لەگەل کردبوون هەردووکیان گوتبوویان:"ئەوەی لەگەل حیزبی ئیوە کراوە پەڵەیەکی شەرمە بە نێو چاوانی پارتییەوە بەڵام بەڵێن دەدەین دووپات نەبێتەوە. ئەودەم ئێمە زۆر خۆشحاڵ بووین هیوامان پێدا کەشتی واتازە نەبێتەوە. کەچی جگە لەو جینایەتانە کە دواتر دەرهەقی کوردی ئێرانیان کردو لەمەودوا باسیان دەکەین. زۆر بەداخەوە ئێستا دەبینین هەر ئەو جەنابی عەلی عەبدوڵڵایە. پەڵەی شەرم و شوورەییەکەی هێندە گەورەتر کردوەتەوە کە نەک هەر نێو چاوان و سەر بەڵکوو تەواوی ئەندامی لەشی پارتی داگرتووە.

له یازده‌ی مارسی ساڵی ۱۹۷۰ دا دوای چه‌ندین جار هات و چۆی نێوان نوێنه‌رانی ده‌وڵه‌تی عێراق و بزوتنه‌وه‌ی نه‌ته‌وایه‌تی گه‌لی کوردستانی عێراق به‌یاننامه‌یه‌دا به‌ناوبانگی یازده‌ی مارس بڵاوکرایه‌وه، له‌و به‌یاننامه‌دا مافه نه‌ته‌وایه‌تییه‌کانی گه‌لی کورد له عێراق به شێوه‌ی خودموختاری به‌ڕه‌سمی ناسرا بوون و به‌ردی بناخه‌ی چاره‌سه‌رکردنی یه‌کجاری مه‌سه‌له‌ی کورد له عێراق دا دانرابوو. لێره‌دا به‌ڕاشکاوی ده‌بێ بگوترێ که به‌داخه‌وه به‌یاننامه‌ی یازده‌ی مارسی ۱۹۷۰ ی عێراق وه‌ک شووشه‌یه‌کی ناسک وابوو که دابێته ده‌ست هێندێ منداڵی نه‌زان یاری پێ بکه‌ن و له رووی نه‌فامییه‌وه بیشکێنن. ئه‌گینا ئه‌و سه‌نه‌ده مێژووییه مافی خودموختاری گه‌لی کوردی عێراقی به ته‌واوی تێدا گونجا بوو هه‌ر له‌و کاته‌دا ده‌یتوانی ببێته نموونه و ئولگویه‌ک بۆ چاره‌سه‌ری مه‌سه‌له‌ی کورد له به‌شه‌کانی دیکه‌ی کوردستانیش.

به‌ڵام ده‌وڵه‌تی حه‌مه‌ڕه‌زا شا که‌نه‌ی ده‌توانی له دراوسێیه‌تی ئێران دا و له ته‌نیشت پێنج میلیۆن کوردی ئێران کوردستانێکی خودموختار به چاو ببینی هه‌ر له رۆژی ده‌رچوونی ئه‌و به‌یاننامه‌یه‌وه که‌وته پیلان گێڕان بۆ له نێو بردنی ئه‌و ده‌سکه‌وته مێژووییه‌ی گه‌لی کورد.

بۆ ئەو مەبەستە هەر چەندی توانی خۆی لە بارزانی نیزیک کردەوە و بە گوێ دا خوێند تاکوو موحیتی تەفاهوم و برایەتی لە نێوان دەوڵەتی عێراق و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد دا تێک بدا و بەوجۆرە پێشی جێ بەجێ بوونی ناوەڕۆکی ئەو بەیاننامەیە بگرێ.

سەرۆکایەتی بارزانیش بێ سەرنجدان بەو واقیعەتە کە ئەو بەیاننامەیە بەرهەمی دەیان ساڵ خەبات و تێکۆشانی رۆڵە رزگاریخوازەکانی گەلی کوردە و بێ ئەوەی بیر بکاتەوە کە بەیاننامەی یازدەی مارس بەخوێنی دەیان هەزار شەهیدی کوردستانە، بەدندانی نۆکەرانی ئیمپریالیزم کەوتە تێکدانی ئەو هەل و مەرجە لەبار و پڕ لە دۆستایەتییە کە لە نێوان دەوڵەتی عێراق و بزوتنەوەی گەلی کورد دا پێک هاتبوو.

لێرەدا ئێمە بە هیچ جۆر نامانەوێ پاکانە بۆ کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بکەین و هەموو تاوانەکە بخەینە ئەستۆی سەرۆکایەتی بارزانی. بەڵام هێندێ واقعیەت هەن کە پێمان خۆشە بێ ترس و بێ پەردە بیان خەینە بەرچاوی بیروڕای گشتی خەڵکی کوردستان چ لە ئێران و چ لە عێراق و چ لە هەر شوێنێکی دیکە کە کوردی تێدا دەژی، بۆ ئەوەی بزانن ئەگەر سەرۆکایەتی بزوتنەوە هەستی بە مەسئوولییەت کردبا دەیتوانی کوردستانی عێراق لەشەڕ و ماڵ وێرانی و سەرەنجام ئاش بەتاڵی سەر شۆڕانە بپارێزێ.

بە ئیعترافی نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کاتێک لە فیویەی ١٩٧٠ دا بۆ یەکەم جار دەستەی نوینەرایەتی پارتی بە نهێنی چوو بووە بەغدا و چاوی بە"سەدام حسین" جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کەوتبوو نوێنەرانی پارتی داوای جێ بەجێ کردنی بەیاننامەی ٢٩ ی ژوئینیان کردبوو کە کاتی خۆی لەلایەن "عبدوالرحمن بزاز"ەوە دەرچوو بوو و تەنیا نەوعێک عدم تمرکزی بۆ کوردستان تێدا بوو. بەڵام سەدام حسین گوتبووی": بۆ چی بەیاننامەی ٢٩ی ژوئین ؟ ئێوە وەک نەتەوەیەک لە عێراق دا مافی خودموختاریتان هەیە. وەرن با لەسەر ئەو ئەساسە قسەی لێ بکەین و بە یەکجاری مەسەلەکە ببڕێنەوە". بەو چەشنە لەسەر مێزی وتوویژ نوێنەرانی دەوڵەتی مەرکەزی بۆ مەسەلەی خودموختاری کوردستان پێشدەست ببون.

هەر بە ئیقراری نوێنەرانی پارتی پاش ڕێک کەوتن لەسەر چوارچێوەی بەیاننامەی یازدەی مارس ەسدام حسین پێشنیاری کردبوو ئێستا کە لە سەر مەسەلەی خودموختاری ڕێک کەوتووین با لەسەر سنوور و سەراوردی ناوچەی خودموختاری وتوویژ بکەین و ڕێگایەک بۆ ناکۆکی و نێوان ناخۆشی لە دواڕۆژدا نەهێڵێنەوە. بەڵام نوێنەرانی پارتی کە وا دیارە لە ڕێک کەوتنەکە زیاد لە ڕادەی پێویست بەپەلە بوون،

گوتبوویان نەخەیر ئەو بەشە هەڵدەگرین بۆ دوایی کە هەل و مەرج ئامادەتر بێ ئەو بەدبینییەی لە نەتیجەی چەند ساڵ شەڕدا دروست بووە لە نێو بچێ. بەو جۆرە یەکێک لەمەسەلە بنەڕەتییەکانی چارەسەر کردنی مەسەلی کوردیان حەواڵەی قەزاو قەدەر کردبوو.

### هەڵوێستی پارتی بەرامبەر بە حزبی ئێران دیموکراتی کوردستانی پاش بلاوبوونەوەی بەیاننامەی یازدەی مارس

بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی یازدەی مارسی ١٩٧٠ بۆ ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان دا وەک مزگێنی نەجات و سوودی سەرکەوتنی خەبات بوو. هەر بۆیەش لە سەرتاسەری کوردستان دا جێژنی بۆ کراو شیرینی بۆ بەشرایەوە. بەڵام ئەوەی زیاتر لە هەمووان بە دەرچوونی ئەو سەنەدە مێژووییە خۆشحاڵ ببو بەڕێوەبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو. بەشێکی زۆر لە کادری بەڕێوەبەریی و کادر و مەسئوولەکانی حیزبمان کە لەکوردستانی عێراق دەژیان و چەند ساڵ بوو بەبیانوی پاراستنی قازانجی بزوتنەوەی کوردهەموو چەشنە تێکۆشانێکیان لێ قەدەغە کراوە و سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کوردستانی عێراق ئیحتاجی بە ئێران نەماوە. ئەمجار نەک هەر ڕێگایان دەدەن تێکۆشانی سیاسی خۆیان لە دەرەوە و لە نێو خۆی وڵاتدا پەرە پێ بدەن، بەڵکوو یارمەتیشیان دەکەن و ئەگەر

پێویست بێ پێشمەرگەی خۆشیان دەنێرن کە شان بەشانی براکان لە کوردستانی ئێران دژی ڕێژێمی ئیستبدادی پەهلەوی شەڕ بکەن. بەڕاستیش ئەو ئامادەییە لە زۆر پێشمەرگەی کوردی عێراق بەدی کرا. بەو هیوا و هومێدەوە ماوەیەک دوای دەرچوونی بەیاننامەی یازدەی مارس هێندێ لە بەڕێوەبەرانی حیزبی ئێمە چوونە لای بارزانی. پاش پیرۆزبایی و خۆشحاڵی دەربڕین داوایان لێکرد، کە دەستوور بدا لە ناوچەکانی سنووری کوردستان مەسئوولانی پارتی و پێشمەرگە پێش تێکۆشان و هات و چۆی کادرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان نەگرن و یارمەتییان بدەن بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکانی حیزبی لە کوردستانی ئێران دا پەرە پێ بدەن. تەنانەت داوای ئەوەشیان لیکرد کە، لە باری کەرەستەی چاپەمەنیشەوە کۆمەکیان بکەن تا کوو چاپەمەنی حیزب بڵاو بکەنەوە و بەرەبەرە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی ئێران بۆ بەرەنگار بوونەوەیەکی توند و تیژ لە گەڵ ڕێژیمی حەمەڕەزاشا ئامادە بکەن. بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانی بەڕێوەبەرانی حیزبی ئێمە وەڵامی بارزانی ئەوەبوو کە بەهیچ جۆرێ نابێ هات و چۆی کوردستانی ئێران بکەن و لە کوردستانی عێراقیش باش نیە زۆر دیار بن و بنکەی پێشمەرگەتان هەبێ بە تایبەتی لە ناوچەی سنوور. ئەمجار دەرکردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنیش کارێکی خراپە، چونکە بڵاودەبێتەوە و

خەڵک دەیخوێننەوە و لەسەری دەگیرێ. کەوابوو ئێستا کە حوکمی زاتی هەیە و وەزیری کورد هەیە باشترە ئێوە بچن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق پەیوەندی بگرن و لە نێو شارەکانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەت بۆ خۆتان دانیشن. هەروەها گوتی من بۆ خۆم بە وەزیری کاروباری شیمال دەڵێم قسەتان بۆ دەگەڵ دەوڵەتی بەغدا بکا و بۆ خۆیشتان بچن و بیان بینن.

بە کورتی جەنابی بارزانی، سووک و هاسان تێی گەیاندن کە حیزبی دیموکراتی چەوت حاڵی بووە و پەیوەندی سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کوردی عێراق لەگەڵ ڕێژیمی شاهەنشاهی نەپساوە بەڵکوو تازە خەریکە بەهێز دەبێ و لە پاشەڕۆژدا دەگاتە ڕادەی هاوکاری و هاوپەیوەندی تەواویش.

ئەو جوابەی بارزانی بۆ بەڕێوەبەری حیزبی ئێمە یەکجار ناخۆش بوو، حیزبی ئێمە لە لایەک نەی دەویست لەگەڵ دەوڵەتی عێراق پەیوەندی هەبێ، چونکە دەیزانی لە دواڕۆژدا هەر ئەو جەنابی بارزانیە کە بۆ خۆی گرتنی ئەم پێوەندیە پێشنیار دەکا چی پێ دەڵێ. لەلایەکی دیکەش حیزبی ئێمە پێی ناخۆش بوو ناوەندی تێکۆشانی سیاسی خۆی لە کوردستانی عێراق بەرێتە دەر چونکە لە وڵاتەکەی خۆی دوور دەکەوتەوە و هاتووچۆو پەیوەندیی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی حیزبی لە ژوورەوەی وڵات دا دژوارتر دەبوو. هەر لەبەر ئەوە زۆری هەوڵ دا

بارزانی ڕێگای بدا لە کوردستان بمینیتەوە با هیچ جۆرە یارمەتییەکیش نەدا چونکە دەیزانی ئەگەر لە وڵاتی خۆی نیزیک بێ میللەتی کورد ئەوەندەی یارمەتی دەدا کە هەموو پێویستییەکانی کارو تێکۆشانی سیاسی دابین بکا. بەڵام هەوڵ و تەقەلای بەڕێوەبەرانی حیزب بە هیچ کوێ نەگەیشت و بارزانی بە هیچ جۆری ڕازی نەبوو کادرەکانی حیزبی ئێمە لە کوردستانی عێراق دا کاری سیاسی بکەن.

ناچار بە پێچەوانەی ویستی خۆیان لە ڕێگای نوێنەرانی بارزانیەوە پەیوەندییان بەدەوڵەتی عێراقەوە گرت و ناوەندی تێکۆشانیان لە عێراق دا گوێزتەوە بۆ شارەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت. دیارە هەر لە سەرەتاوە مەسئوولانی حیزب بە ڕەسمی بە سەرۆکایەتی پارتی و حیزبی بەعسیان ڕاگەیاند کە لەعێراق میوانن و کارێکیان بە کاروباری نێو خۆی عیراق نیە و پێیان خۆشە ئەو دۆستایەتی و هاوکارییە کە لە نێوان ئەو دوو حیزبە عێراق دا پێک هاتوە هەروا بەردەوام بێ و زیاتریش گەشە بکا.

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هۆی ئەساسی قەبووڵ کردنی پێشنیاری ئەو کاتی بارزانی ئەوە بوو کەوەختێک کادرەکانی ئێمە نەیان دەتوانی، بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و لە کوردستانی عێراقیش ڕێگای تێکۆشانیان نەدەدان باشترە هەر لە عێراق بمێننەوە و کەم کەم تێکۆشانی

سیاسییان بخەنەوە نێوخۆی وڵات.
وردە وردە بە نهێنی هێندێک لە کادرەکانی حیزب بۆ کاری حیزبی ناردرانەوە نێوخۆی وڵات و بە هەر ڕێگایەک کە بۆیان دەکرا پەیوەندییان لەگەڵ ئەندامان و کادرەکانی نێو خۆی وڵات گرت بۆ ئەوەی، سەر لەنوێ ڕێکخراوەکانی حیزب ببوژێننەوە و تێکۆشانی سیاسی خۆیان پەرە پێ بدەن. ئێستا بزانین سیاسەت و هەڵوێستی سەرۆکایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و بە تایبەتی بنەماڵەی بارزانی بەرامبەر بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران چۆن بووە؟
وەک لە پێش دا باسمان کرد، لەسەر پێشنیاری شەخسی بارزانی و لە ڕێگای نوێنەرانی خۆیەوە ڕێبەرانی حیزبی ئێمە پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق گرت. بەڵام لەبەر ئەوەی ئامادە نەبوون دەست لە کارو تێکۆشانی سیاسی هەڵبگرن لەبەر ئەوەی بەپێچەوانەی دەستووری دەرباری بارزانی ڕۆژنامەیان چاپ دەکرد و لە هەمووی گرنگتر لەبەر ئەوەی ڕێژیمی شا لە زیندوو بوونەوەی تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ناڕازی بوو دەزگای سەر بە بارزانی پروپاگەندێکی ژەهراوی لە دژی حیزبی ئێمە وەڕێ خست و پەیوەندی ڕێبەرایەتی حیزبی ئێمە لەگەل عێراق بەخۆفرۆشی و بەعسیگەری و هەزارە ناو ناتۆرەی دیکە لە قەڵەم دا و بەو جۆرە دەرخوادری خەڵکی بێ خەبەری دا. دیارە تا ڕادەیەک بەجێش بوو

وابیر بکەنەوە چونکە ئەوان پەیوەندیی بێ خۆفرۆشییان لەگەڵ ئێران دا نەبوو هەر بۆیە ئەو حیسابەشیان بۆ حیزبی ئێمە دەکرد. وەک دەڵێن "کافر همه را به کیش بندارد".

یەکی دیکە لە شاکارەکانی سەرکردایەتی بارزانی ئەوە بوو دەزگای پاراستنی بارزانی بە هاوکاری ڕاستەوخۆی لەگەڵ ساواکی شا چەند نۆکەر و گوێ لە مستی خۆی لە نێو کوردە ئێرانییەکانی دانیشتوی عێراق دا قوت کرد بووە و ناوی نابوون بەڕێوەبەرایەتی کاتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ئەو تاقمەیە کە بەڵگەی هاوکاری زۆر کەسیان لەگەڵ دەزگای جاسوسییەکانی حەمەڕەزاشا لەدست دایە بە کۆمەکی چەک و پولێک کە لەلایەن ساواکەوە بە هۆی دەزگای پاراستنی بارزانییەوە پێیان دەگەیشت توانیبویان چل پەنجا کوردی ساویلکەی ئێرانی فریو بدەن کە شەوو ڕۆژ کرایان ئەوە بوو بسوڕێنەوە و بدە گویی حیزبی ئێمە بکەن. سەرۆکایەتی بە کرێگیراوی ئەو تاقمە کە لەلایەن"حەمە عزیز" سەرۆکی دەفتەری بارزانی یان وەزیری دەرباری بارزانییەوە کەرەستەی چاپەمەنییان بۆ دابین کرابوو زۆر جار بە نوسراویش لە دژی حیزب تەبلیغاتیان دەکرد.

سەرنج ڕاکیش ئەوە بوو کە ئەو تاقمە خۆفرۆشە لە تەواوی نووسراوەکانیاندا تەنانەت تاقە جاریکیش قسەیان بە ڕێژێمی شا نەدەگوت و لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کە زۆر لە نوسراوەکانیان بە ئاشکرا دیاربوو کوردی عێراقی نوسیبونی و ئەو تاقمە بە کرێگیراوە تەنیا ئەوەندەیان لەسەر بووە بە ناوی خۆیان چاپی بکەن. واقاو بوو کە ئەو جۆرە وتارانە بەدەستی" شێخ محەمەدی هەرسینی" نۆکەری ناسراوی ساواک دەنووسرێن.(خۆش ئەوەیە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران ئەو شێخ محەمەد هەرسینییە بەدەستی داروودەستەی ئیدریس بارزانی بە شێوەیەکی زۆر گومان لێکراو تیرۆر کرا. وادیارە زۆر شتی نهێنی زانیوە کە ئیدریس بارزانی ترساوە ڕۆژێک وەدەریان بخا و هێندیکیش دەڵێن پولێکی زۆری لەکن بوە و نەیداوەتەوە بە کوڕەکانی بارزانی). لە هەق دەرنەچین سازکردنی حیزبی کارتۆنی و تاقمی دژی حیزب سیاسەتێک نەبوو کە سەرۆکایەتی بارزانی هەر لە دژی حیزبی ئێمە و کوردی ئێران ڕەچاوی کردبێ. بەڵکوو ئەو سیاسەتەی لەگەڵ کوردەکانی تورکیە و سوریاش بەکار دێناو هەموو کاتێک لە فکری ئەوەدا بوو کە نەهێڵێ لە هیچ پارچەیەکی کوردستان دا حیزبێکی بە هێز و یەکپارچە هەبێ.

سەرەڕای ئەوانەش ئەزیەت و ئازاری ئەندام و لایەنگرانی حیزبی ئێمە کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانییەکان دەژیان ببوە بەشێک لە سیاسەتی ڕۆژانەیان دوژمنایەتی ئەوانە زیاتر لەگەڵ ئەو کادرانەی حیزب بوو کە بۆ کاروتێکۆشانی سیاسی هاتوچۆی وڵاتیان دەکردەوە. کادرێکی حیزبی ئێمە دەهاتەوە ئێران مانگێک دوو مانگ دەمایەوە سازمانی ئەمنیەت شوێنی هەڵنەدەگرت و بۆی نەدەگیرا، بەڵام کاتێک دەگەڕایەوە عێراق بارزانییەکان دەیان گرت و لە زیندانە سامناکەکانی خۆیانیان قایم دەکرد. یەکێک لەو کادرانە کە بەو شێوەیە گیران هاوڕێ شەهید مەلا قادری وێردی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەسئوولی تەشکیلاتی بانە بوو. شەهید مەلا قادر ساڵی ١٣٥١ بەسەردان هاتەوە بانە نزیکەی مانگێک لەو ناوچەیەدا مایەوە. ساواک زەفەری پێ نەبرد. بەڵام کاتێک گەڕایەوە کوردستانی عێراق لە ناوچەی سولەیمانی فەتاح ئاغا فەرماندەی ئەو کاتی هێزی خەبات گرتی ڕەوانەی زیندانی بەناو بانگی ڕایاتی کرد و دایە دەستی سەعید مەسیفی جەللاد کە ماوەی دە ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجەی گیانی و بەدەنییان کرد.

بەڵام کاتێک حیزبی ئێمە ئیعترازی کرد و بەریان دا نامەی ڕەسمی هێزی خەبات بە ئیمزای فەتاح ئاغا وە

لەساکەکەی مەلا قادردا دەرکەوت کە دەنووسی ئەو تاوانبارە!! هاتوچۆی ئێران دەکا و ڕۆژنامە و نووسراوەی حیزبی دیموکرات دەباتەوە ئێران و دەیەوێ پەیوەندی نێوان شۆڕش! و دەوڵەتی ئێران تێک بدا. ئەو نامەیە ئێستاش ماوە و هاوکات و بە پێویست بزانرێ لەگەڵ زۆر بەڵگە دیکە بڵاو دەکرێتەوە.

بەو حاڵەش سیاسەتی حیزبی ئێمە هەر ئەوە بوو کە تەحەمول بکرێ و تەنانەت بە نووسینیش کارێکی وا نەکرێ کە ناکۆکی لە نیوان حیزبی ئێمە و پارتی دا پەرە پێ بدا یان زیانێک بە بزوتنەوەی رزگاریخوازنەی گەلی کورد بگەیەنێ کە سەرکردایەتییەکەی لە ژێر دەسەلاتی بنەماڵەی بارزان دا بوو.

لەبەیاننامەی یازدەی مارسی حەفتادا چوار ساڵ ماوە دانرابوو کە وەزعی کوردستانی عێراق دۆخی ئاسایی بەخۆیەوە بگرێ و ڕێگا بۆ خۆدموختار بوونی کوردستانی عێراق خۆش بکرێ. جا دوای ئەو چوار ساڵە کوردستانی عێراق بە ڕەسمی خودموختاری بدرێتی و دەزگاکانی حکوومەتی خودموختار کاری خۆیان دەست پێ بکەن.

لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا پەیوەندی نێوان سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کورد و دەوڵەتی عێراق بە زۆر قۆناخی جوار و جۆردا تێپەڕی. ئەو دوو سەرکردایەتییە زۆر جار پیلانی خوێناوییان لە دژی یەکتر و لایەنگرانی یەکتر نایەوەو زۆر لە لایەنگرانی پارتی و حیزبی بەعس

لەلایەن هەوادارانی ئەوەی دیکەوە رفێندران و بێ سەر و شوێن کران و زۆر ڕووداوی وا هاتنە پێش کە بەزیانی هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەبی عێراق تەواو بوون. لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا ئەگەر چەند مانگی دوای یازدەمی مارسی لێ دەرکەین زۆر بەکەمی پەیوەندی دۆستانە لە نێوان ئەو دوو سەرکردایەتی یەدا هەبوو. ئەوە بۆ خۆی باسێکی جیاوازە و لەم کورتە باسەی ئێمەدا ناگونجێ. تەنیا شتێکی دەمانەوێ باسی بکەین ئەوەیە کە گەلی کورد نۆ ساڵی تەواو لە پێناوی خودموختاری دا شەڕی کردبوو سەرەنجام دەوڵەتی عێراقی ناچار کرد بوو ئەو مافە ڕەوایەی بەڕەسمی بناسێ. نیزیکەی چوار ساڵیش لە بەیاننامەی یازدەی مارس رابردبوو هێشتا سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کورد گەلاڵەیەکی بۆ خودموختاری نەبوو. لەڕاستی دا سەرۆکایەتی بارزانی بۆ خۆشی بۆی ڕوون نەبوو ئەو خودموختاری یەی دەبێ بە کوردی عێراق دەدرێ چۆنە و کوێ دەگرێتەوە و دەسەلات و ئیختیاری چیە؟ نیزیکی دوومانگ بۆ مارس ١٩٧٤ مابوو کە لە هەل و مەرجێکی زۆر نالەبارو لە موحیتێکی پڕ لە دردۆنگی و بەد گومانی دا هەر دوولا- پارتی و بەعس- دەیان ویست قانوون بۆ خودموختاری دابنێن. لەلایەک دەوڵەتی عێراق لەو ماوەیەدا جێ پێی خۆی قایم کرد بوو و حازر نەبوو

ئیمتیازێک بدا بە کورد تەنانەت حەزی دەکرد تەنیا رەقیبی بەعس لە عێراقدا بزوتنەوەی گەلی کورد بوو لە مەیدان دەربکا. لەلای دیکەش سەرۆکایەتی بارزانی لە گەڵ دەوڵەتی شا بە تەواوی گەیشتبوونە یەک و بە قەولی خۆیان شا بەڵێنی رەسمی لامەحدوود واتە پشتیوانی نامەحدوودی پێ دابوو. بارزانیش بەو وەزعە و بەو قەول و قەرارە کە لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکا بەستبووی حازر نەبوو بستێک پاشەکشە بکا.

لەو ناوەدا کۆمەلانی خەڵکی کورستانیش بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزان بوون کە بەشکوو بتوانن ئەو دوو لایەنە کەلەڕەقە لە یەکتر نیزیک بکەونەوە. لەو بارەوە بەڕێوەبەرانی حیزبی ئێمە تەقەلایەکی زۆریان بە خەرج دا و زۆر تێکۆشان بۆ ئەوەی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد و کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بگەنە یەک و گەلی کورد جارێکی دیکە تووشی شەڕو ماڵ وێرانی نەبێ. بێجگە لەوەش بەڕێوەبەرایەتی حیزبی ئێمە بە تەواوی نیگەرانی ئەوەبوو کە ڕۆژێک ئێران و عێراق ڕێک کەون و بزوتنەوەی هەقخوازی گەلی کورد ببێتە قوربانی ئەو ڕێک کەوتنە. نیگەرانی لە چارەنووسی گەلی کورد و لەڕێک کەوتنی ئێران و عێراق لەسەر حیسابی بزوتنەوەی کورد شتێک نەبوو هەر لە مێشکی ڕێبەرانی حیزبی ئێمەدا بێ. لە چاوپێکەوتنێکی سکرتێری گشتی حیزبی ئێمە لەگەڵ مەلا

مستەفا بارزانی لە زستانی ساڵی ١٣٥٢ دا دکتۆر قاسملۆ بە بارزانی گوت: تۆ ئەوەندە تەکیە دەکەیە سەر کۆمەک و پشتیوانی دەوڵەتی ئێران. نازانی حەمە ڕەزا شا دوژمنی سوێند خۆری گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستانە؟ تۆ هیچ بیرت لەوە کردوەتەوە ئەگەر ڕۆژێک دەوڵەتی شا و دەوڵەتی عێراق ڕێککەوتن تەکلیفی بزوتنەوەی گەلی کورد چیە؟ بارزانی کە لە مانۆڕدا بەڕاستی وەستا بوو گوتی: ئەودەم منیش لەگەڵ تۆ ڕێک دەکەوم و پێکەوە لێی دەدەین.

کاتێک حیزبی ئێمە بۆی دەرکەوت کە تازەبوونەوەی شەڕ لە عێراق دا شتێکی مسۆگەرە بڕیاری دا بەشێک لەو کادر ومەسئوولانەی لە عێراقن لە نێوشارەکان بمێننەوە و بەشەکەی دیکەیان بێنە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە. چونکە پێمان وابوو ئەگەر هەموویان بێنە کوردستان مەترسی ئەوە هەیە کە وەک جاری پێشوو تەحویلی ئێران بدرێنەوە بە قەولی کوردەکانی عێراق بدرێن بە رۆنی شاپەسند.

ئەگەر هەمووشیان لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت دابن لەوانەیە دەوڵەتی عێراق فشاریان بۆ بێنێ و ناچاریان بکا کەدژی بزوتنەوەی گەلی کوردی عێراق هەڵوێست بگرن. ئەوەش شتێک بوو کە کادر و ئەندامانی حیزبی ئێمە لە سەختترین هەل و مەرجیش دا و تەنانەت لە کاتێک دا کە گیانیشیان کەوتووەتە

مەترسییەوە نەچوونە ژێر باری و ملیان ڕانەکێشاوە.

ئەو بڕیارەی بەڕێوەبەرایەتی لەلایەن کادرو مەسئوولەکانی دانیشتووی عێراقەوە جێ بەجێ کرا. بەشێکیان لە نێو شارەکان دا مانەوە زۆربەی هەر زۆریشیان هاتنەوە کوردستان و ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە. لەماوەی یەک ساڵ شەڕی دوایی کوردستانی عێراق دا رابەرانی حیزبی ئێمە و ئەو کادر و ئەندامانەش کە لە عێراق و لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت دەژیان سیاسەتی ئوسوولی حیزبیان بەڕێوە برد و هیچ کاتێک نە بە قسە نە بەکردەوە نە بە نووسین شتێکیان نەکرد کە زیان بە بزوتنەوەی کوردی عێراق بگەیەنێ. چونکە هەر وەک لە یاداشتی حیزبی ئێمەدا بۆ سەرۆکایەتی پارتی گوترابوو. هیچ وەخت نابێ پەیوەندی نێوان بەشێک لە بزوتنەوەی گەلی کورد لە گەڵ حکوومەتەکانی دراوسێ بە زیانی بزوتنەوەی کورد لەو وڵاتەدا تەواوبێ. ئەمە سیاسەتێکە کە حیزبی ئێمە ئێستاش و لە داهاتووش دا هەر لەسەری دەڕوا.

بەڵام سەرکردایەتی بارزانی بە پێچەوانەی ئەو سیاسەتە ئووسوڵی یە لە ماوەی ئەو ساڵەش دا دەستی لە ئازار و جەزرەبەی تێکۆشەرانی حیزبی ئێمە هەڵنەگرت و دیسان هەر گرتن و ئازاردانی برادەرانی ئێمە درێژەی هەبوو دیسانیش تاقمی بەکرێگیراو لە دژی ئێمە هان دەدران و دیسانیش پڕوپاگەندەی ژەهراوی لە

دژی حیزبی ئێمه بڵاو دەکرایەوە.
لە مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٥٢ دا شەڕ لە کوردستانی عێراق دا دەستی پێ کرد. دەوڵەتی عێراق بە تەواوی ئیمکاناتی نیزامی خۆیەوە پەلاماری هێنایە سەر کوردستان وشار و گوند و شاخ و دەشتی پێکەوە سوتا. خەڵکی کوردستانی عێراقیش لە هەموو ناوچەکان دا وەک یەک ڕاپەڕی و یەکپارچە پشتیوانی خۆی لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد دەربڕی. دەتوانین بڵێین ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٧٤ی خەڵکی کوردستانی عێراق هەتا ئەو دەم لە مێژووی نەتەوەی کورد دا بێ وێنە بوو. بەڵام بزانین سەرۆکایەتی بزوتنەوە چۆنی لەو ڕاپەڕینە گەلییە کەڵک وەرگرت؟ ئەگەر لە پاش ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی سەرۆکایەتی بارزانی پشتی کردە گەلی کوردی ئێران و کۆمەک و یارمەتی ڕێژێمی حەمەڕەزاشای لە جێگای یارمەتی کوردی ئێران دا نا. نۆ ساڵ پاش ئەوە واتە ساڵی١٢٥٣ ئەو سەرۆکایەتی یە بە جارێک پشتی کردە کوردی عێراقیش و بە تەواوی پاڵی بە ڕیژێمی دیکتاتۆری پەهلەوەی و ئیمپریالیزمی ئەمریکا دا. ئەگەر لە ساڵەکانی پێش ١٩٧٠ دا پەیوەندی لەگەڵ ڕێژێمی شایان دەشاردەوە ئەمجار شانازییان بەو پەیوەندییەوە دەکرد و بە هەموو تواناوە تێدەکۆشان بنەماڵەی پەهلەوی بەدۆست و پشتیوانی واقیعی گەلی کورد دا بنێن.

بارزانی لە وتووێژە چاپەمەنییەکانی خۆی دا هەمیشە داوای کۆمەک و یارمەتی ئینسانی!! لە رۆژئاوا دەکرد و جاری واش هەبوو کە زیاتر دەرۆیشت و بەپانەوە دەیگوت کوردستان دەکەمە ئەیالەتی پەنجا و یەکەمی ئەمریکا.

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە چەوتە دا هێزی پێشمەرگەش ئەو ئیمان و بڕوایەی بەستبوو. هەر بۆیە بە ماوەی کەمتر لە دوو مانگ ئەرتەشی عێراق توانی بەشی هەرە زۆری ناوچەکانی کوردستان بگرێتەوە و لە هەموو جەبهەکان دا شەڕ بخاتە نیزیک سنورەکانی ئێران. لێرەدا سەرۆکایەتی بارزانی بەهاوکاری ڕێژێمی شای بەکرێگیراو چەندین ئۆردگای پەنابەرانی لە ئێران دا کردەوە و ماڵە کوردەکانی عێراقی نبوە بە زۆر نیوە بە خواهیشت لەسنووری ئێران ئاوای ئەم دیو کرد. کاربەدەستانی دەسەلاتداری بزوتنەوە بە ئاشکرا ڕایان دەگەیاند هەر کەس لە شارەکان دا وەمێنێ جاشە و هەرکەس ئامادە نەبێ ماڵەکەی بەرێتە ئێران جاشە. لە ئاکام دا جگە لە بەشێک لە دانیشتوانی ناوچە سنووری یەکان هەرچی بنەماڵەی پێشمەرگە و تەنانەت قاچاغی غەیری پێشمەرگەش بوو لە ئێرانیان پەستاوت. تمەنی"دەوڵەتی شاهنشاهی"!! لە کوردستانی عێراق ئاشی پێ دەگەڕا. ئەگەر ئابووری ئەودەمی ئێران وەک ئێستا کز و لەرزووک نەبوو و پوولی ئێران لە زۆربەی

وڵاتەکانی دەرەوە وەک پوڵێکی ڕەواج وەردەگیرا بەڵام لە کوردستانی عێراق لە نەتیجەی زۆر بوونی تمەن و کەم بوونی دیناردا دینارێکی عیراقی ١٩ تمەنی ئێرانییەوە پاڵی وەبیست و هەشت تمەن دا. بە دوای ئەوەدا لەسەر خەڵکی کوردستانیان کرد کە هەر کەس دینار لە بیست تمەن زیاتر بفرۆشێ سزا دەدرێ و کاتێک بەوەش باشاریان نەکرد بەڕەسمی موعامەلەیان خستە سەر تمەن و بەو کردەوە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بارزانی لە باری ئابوورییەوە بوو بە بە شێک لە ئێران.

خۆ لە باری نیزامیشەوە وەزعەکە لەوەباشتر نەبوو. لەسەرەتادا تۆپخانەی دوور هاوێژی ئێران لە خاکی ئێرانەوە ناوچە سنوورییەکانی عێراقی دەکوتا. بەڵام زۆری پێ نەچوو کە شەرم و شکۆ هەڵگیرا و ئەرتەشی ئێران لە خاکی کوردستانی عێراق دا جێگیر بوو. ئەم جار ئیتر بە هەر جێگایەک دا رۆیشتبای تۆپخانەی ئەرتەشی ئێران و شەبەکەی دژی هەوایی و تەنانەت مووشەکی دژی هەوایی ئێرانت دەدی. ڕێبوارێک لە نێو جەرگی کوردستانی عێراق دا زۆر جار تووشی دەستەیەک پێشمەرگە دەبوو بە کوردی قسەی لەگەڵ دەکردن حاڵی نەدەبوون. پاشان بۆی دەردەکەوت کە ئەو بە ناو پێشمەرگانە شاهەنشا بۆ رزگارکردنی کوردستان!! بە هاواری بارزانییەوە ناردوونی.

له ئـاخر و ئـۆخری پـاییزی ١٣٥٣ دا وەزعەکە وای لـێ هــات کە بـێجگە لە نـاوچەی سـولەیمانی لە تەواوی جەبهەکان دا شەڕی ئەسڵی لە نێوان ئەرتەشی ئێران و ئەرتەشـی عێـراق دا بـوو هەر ئەو دەم کە هێنـدێ لە کاربەدەسـتانی سـەر بە دەزگـای بـارزانی دڵخۆشـی خەڵکیـان بەوە دەدایەوە کە ئێرانییەکـان تـۆپی وایـان هێناوە لوولەکەی نۆ میتر درێژە. دڵسۆزی مەسەلەی کورد دەیانی زانی کە وەختێک ئێران و عێراق پێکەوە بەشەڕ دێـن، سبەی ڕۆژیش ئەوانـن کە پێـک دێـن و لەو نـاوەدا کوردەکە دەم لە پووش دەبێ، دیارە زۆر لە مسئوولەکانی پارتیش ئەو نیگەرانییەیان بەتوندی هەبوو بەڵام چما لە ترسی بارزانی دەیان وێرا قسە بکەن؟.

لە بەفرانبـاری ١٣٥٣ ڕۆژنامەنوسـێکی بێگـانە لە حەمەڕەزاشـای پرسـی:" لەوانەیە ئێـوە لەسـەر حیسـابی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتـی عێراق ڕێک کەون؟ حەمەڕەزا شـا لە وەڵام دا گـوتی:"ئێمە هـیچ وەخـت نیازمـان نـیە کوردەکان بفرۆشـین بەڵام دیـارە وەختێک دوو لایەن پێک دێن لایەنی سێیەم دەبێ شتێک بدۆڕێنێ" بەداخەوە ئەو جوابە سەریحەی حەمەڕەزاشـاش نەیتـوانی بـارزانی لە خەو ڕاپەڕێنـێ و هەروەک هەمیشـە جێگـای هومێـدی بـارزانی" هەوەڵـی شـا - دووهەم خـوا بـوو. لەسـەرتای مـانگی ١٩٧٥ دا بە بیـانووی کۆنفرانسـی ئـۆپیکەوە شـا و سەدام حسێن لە ئەلجزیـرە پێتەختـی

ئەلجزائیر چاویان بە یەک کەوت و بە نێو بڕی گەری" هەواری بومیدیەن" رێککەوتننامەی بەناوبانگی شەشی مارسیان ئیمزا کرد. ئەو ڕێک کەوتنە هێندێک ناکۆکی کۆنی سەرسنووریشی تێدا چارەسەر کرابوو. بەڵام مەسەلەی ئەساسی رێککەوتننامەی سێ ماددەیی ئەلجەزیر دوایی هێنان بە پشتیوانی شا لە بزوتنەوەی کورد و تەنانەت هاوکاری دوو دەوڵەتی ئێران و عێراق لە دژی بزوتنەوەی کورد بوو.

بە بڵاو بوونەوەی خەبەری رێک کەوتنی شا و سەدام نیگەرانی هەموو کوڕ و کۆمەڵەکانی دڵسۆزی مەسەلەی کوردی داگرت، زۆر کەس هەر دەسبەجێ تێگەیشتن کە بزوتنەوەی ژێر سەرکردایەتی بارزانی ئاخر ڕۆژەکانی تەمەنی بەسەر دەبا بەڵام هێندێ کەس هیوادار بوون کە بزوتنەوەی کوردی عیراق بە شێوەی پارتیزانی درێژە بە ژیانی خۆی بدا. بەپێی ئەو خەبەرانە کە ئەو دەم گەیشتن لەسەرتا دا شوورایەکیش پێک هاتبوو بۆ ئەوەی بە ژمارەیەکی کەم پێشمەرگەی ئازاوە شەڕێکی درێژخایەنی پارتیزانی دەست پێ بکا. بەڵام بارزانی سەفەرێکی تاران دەکا چاوی بە شا دەکەوێ و دەگەڕێتەوە ئەمجارە دژی هەر چەشنە بەربەرەکانێیەک ڕادەوەستێ و بەڕەسمی ئاش بەتاڵەکە ڕادەگەیەنێ. پاش ئاوا بوون بۆ کوردستانی ئێران بارزانی بەشێکی زۆر لە کوردە

ئاوارەکـــان لـە نـەغـەدە کۆدەکـــاتـەوە و قـســەیان بــۆ دەکـــا. لـەویـــش دا بـــۆ ئـەوەی هـــیچ ڕێگــــایـەک نـەهێڵێـتـەوە دەڵـێ جـاران چـەکمـان پــێ بـوو سـەدی ٣٠ هیـوام بـە ســەرکەوتن هـەبــوو. بـەڵام ئێســتـا ســەدی ٧٠ هیـــوادارم بـەم زووانـە ســـەرکەوین. بـەم جـــۆرە شــــەڕی یـەک ســاڵـەی ١٣٥٣ی کوردســتـانی عێــراق کـە زیــاتر بـە هانــدانی ڕیـژێمــی شـاو ئیمپریـالیزمی ئـەمریکـا دەسـتـی پـــێ کرابـــوو، بـە دەســتووری ئـەوانــیش کۆتــایی هــات و پــاش یـەک ســـاڵ مـەرگ و مـــاڵ ویّرانــــی پـــاش ئـەوەی گـەلــی کــوردی عێــراق بـەو یـەک ســاڵـە زۆر زیــاتر لـە نـۆ ســـاڵی پـــێش ١٩٧٠ قوربـــانی دا و پـــاش ئـــاوارە و دەربـەدەر بـــوونی ســـەدان هـەزار کـــوردی عێــــراق ســەرۆکایـەتی بــارزانی تـەواوی دەسکەوتی چـەنـد ســاڵ خـەبــاتی گـەلــی کــوردی بـە هانــدانی دوژمنــانی کــورد بـەفیـــرۆ دا. ئێســـتاش کـە ئێســـتـایـە نـە بـــارزانی و نـە بنـەمـــاڵـەکـەی تـەنـــانـەت حـــازر نـەبـــوون تۆزقــاڵێکیش لـە مـەســئوولیـەتی ئـەو شکســتـە مێــژووییـە وەئـەســتۆ بگــرن و دان بـەوە دابـنـێن کـە مســقاڵێکیش هـەڵـەیــان کــردوە. بـەڵام دوای ئـەو تێکۆشـــــانـە گـەورەیـە زۆر شـــت بـــــۆ خـەبـــاتکـەرانی گـەلــــی کــورد ڕوون بـــووە و زۆر نهێنـــی ئاشـکرا بـــوون. هـەر چـەنـد ئـەو شکســتـە بـۆ گـەلـــی کــورد زۆر گـــــران تـەواو بـــــوو. بـەڵام تــــــاقیکردنـەوەی بـە نرخیشــی دایـە دەســتی تێکۆشـــەرانی دوا ڕۆژی ڕێـگــــای ڕزگــــاری کوردســـــتان. ســـــاڵی ١٩٧٥ بـە دوای ئـــاش

بەتاڵی بارزانی دا "پایک" ڕاپۆرتێکی پێشکەشی مەجلیسی نوێنەرانی ئەمریکا کرد کە لەودا بە بەڵگەو سەند پەردەی لەسەر هاوکاری بارزانی و سیا واتە دەزگای جاسوسی ئەمریکا و کۆمەکی شازدە ملیۆن دۆلاری ئەمریکا بە بارزانی هەڵدابوو. ئەو ڕاپۆرتە لە ڕۆژنامەی"ویلاچ وویس" ئەمریکایی دا بڵاو کرایەوە.

بەڵام بارزانی و دەست و پێوەندەکانی هەتا ساڵی١٩٧٧ بە ڕەسمی باسی ئەو هاوکارییەیان نەدەکرد. لە ٩ی مانگی فیورییەی ١٩٧٧ دا بارزانی ئەو کاتە لە ئەمریکا دەژیا نامەیەکی بۆ سەرکۆماری ئەو وەختی ئەمریکا جیمی کارتەر نووسی بوو. پاشان کارتەر وەڵامی نەدابووە. لە ڕۆژی٣ی مارسی ئەو ساڵەدا نامەیەکی دیکەی بۆ جیمی کارتەر ناردبوو لەگەڵ ئەودا ڕوونووسی نامەیەکی هێنری کیسنجر وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکاشی بۆ ناردبوو کە لە ٢٢ی مانگی فیۆرییەی ١٩٧٧ دا بۆ بارزانی نووسیبووی، هەروەها بارزانی لە ١٤ی فیۆرییەی ١٩٧٧ دا نامەیەکیشی بۆ ئەندامانی کۆنگرەی ئەمریکا ناردبوو. ئەو نووسراوانە وەختی خۆی لە ئەمریکا و ئورووپا بڵاوکرانەوە و نوسخەکەیان لەلای حیزبی ئێمە هەیە. بەڵام لێرەدا چەند بەشی بچووک لە نامەکانی بارزانی بۆ جیمی کارتەر باس دەکەین تا بزانین بە چ هیواو هومێدێکەوە چاوی بریوە بە ئەمریکا و

چۆن بە ئیمانەوە داوای کۆمەکی لە کارتەر کردووە.
بارزانی لە نامەی خۆی دا بەراشکاوی ڕیژێمی شا و ئیمپریالیزمی ئەمریکا بە دۆست و پشتیوانی خۆیدەزانێ و دەنووسێ:

"کاتێک پێکەوە ژیانی بە ئاشتی لەگەڵ ڕێژێمی بەعس لە توانادا نەما ئێمە ڕوومان کردە دۆستە ئەمریکایی و ئێرانییەکانمان" هەموو کەس دەزانێ کە بارزانی لە ئێران دا بێجگە لە ڕیژێمی شا دۆستایەتی لەگەڵ کەسی دیکە نەکردووە. کەوابوو دۆستە ئێرانییەکەی شایە و دۆستە ئەمریکایەکەشی"سیا" یە نەک گەلانی ئێران و ئەمریکا.

بارزانی لەسەر نووسینەکەی دەڕوا دەڵێ:

" پێیان گوتین کە شۆڕشی کورد هەم لەلایەن ئەمریکا و هەم لەلایەن ئێرانەوە یارمەتی دەدرێ بە جۆرێک کە کوردەکان بتوانن دژی ڕیژێمی عێراق خەبات بکەن و بۆ ئەوەی خودموختارییەکی ڕاستەقینە بۆ کورد و حکوومەتێکی دیموکراتی بۆ عێراق دابین بکەن". بەو جۆرە بارزانی هیوای بەدۆستە ئیمپریالیستی و کۆنەپەرستەکانی بووە کە خودموختاری راستەقینەی بۆ وەربگرن.

بارزانی زیاتر لەسەری دەڕوا و بە راشکاوی دەڵێ کە لەسەر قەولی ئەمریکا و ئێران شەڕی

سازکردوتەوەتەوە. سەرنج بدەن:
"کاتێک قانوونی خودموختاری بە چەشنی یەک لایەنی لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە راگەیاندرا کە ئیعترافی بە لانی کەمی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد نەدەکرد. ئێمە لەبەر قەولی یارمەتی دۆستەکانمان ئەو قانوونەمان رەت کردەوە".

دواتریش دەنووسێ:

**" ئێمە تەنیا دەمانەوێ قەولی خودموختاری کە بە ئێمە دراوە بێتەدی".**

وەک دیتمان بارزانی ئیعتراف دەکا کە لە سەر قەولی ئەمریکا و ئێران قانوونی خودموختاری عیراقی رەت کردوەتەوە و داواش دەکا ئەمریکا و ئێران قەولی خودموختاری کە بەویان داوە بیبەنە سەر. بێ جێ نیە لێرەدا ئەوەش بگوترێ کە ئەو قانوونی بارزانی دەنووسێ: ئیعتراف بە لانی کەمی مافی نەتەوایەتی کوردی تێدانیە وەک قانوون شتێکی باشە و زۆر لە داواکانی گەلی کوردی تێدا گونجاون. نوێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە چاوپێکەوتن لەگەڵ بەنی سەدردا داوایان کرد کە ئەو خودموختارییەی دەوڵەتی عیراق ئیعترافی پێ کردوە بدەن بە کوردی ئێران. بەڵام ئەو دەوڵەتەی ئێستا بنەماڵەی بارزانی بە دڵ و گیان جاشایەتی بۆ دەکەن حازر نەبوو نەک ئەوە بەڵکوو نیوەی ئەوەش بدا بە

کوردی ئێران.

لە کۆتایی نامەکەدا بارزانی بە تەواوی دڵپاکی و ئیمانی خۆی سەبارەت بە جیمی کارتەر و سەرکۆماری گەورەترین وڵاتی ئیمپریالیستی دەردەبڕێ و دەنووسێ: "پەنجا ساڵە گەلی من بڕوا و ئیمانی تەواوی خۆی داوە بەمن. منیش ئەو بڕوایە پێشکەشی ئێوە دەکەم"؛. سەیر لەوە دایە بەڕێوەبەرانی قیادەی مووەقەت لە یەک دووساڵی ئاش بەتاڵ دا هەمیشە حاشایان لەوە دەکرد کە پەیوەندییان بە بارزانی یەوە مابێ و تەنانەت جاروبار ڕەخنەشیان لە ئاکار و کردەوەی سەرۆکایەتی پێشووی پارتی دەگرت. کەچی بارزانی تەواوی نامەکانی خۆی بەناوی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە ئیمزا کردبوو. دواڕۆژیش نیشانی دا کە قیادی موقتیش هەر بارزانی بڕیویەتی و هەربارزانی دروویەتی. ئێستاش لە بەرچاومانە کە بەڕێوەبەرانی تازەی ئەو تاقمەیە لەسەر ئەوە سوورن کە ڕێگای بارزانی ڕێگای لەڕێ لادانی بزوتنەوەی کورد و ڕێگای هاودەستی لەگەڵ ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی درێژە پێ بدەن. تەنانەت هەوڵ دەدەن چەندین هەنگاویش لە بارزانی پێشتر کەون. بە پیرۆزیان بێ!.

هەڵوێستی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەرامبەر بە قیادە موەقەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران پاش زیاتر لە یەکساڵ ڕاپەڕین و قوربانی

دانـــی گەلانـــی ئێـران لـە ٢٢ی ڕێبەنـدانی سـاڵی ١٣٥٧ دا شۆڕشی خـەڵکی ئێران یـەکەم قۆنـاخی سـەرکەوتنی بـڕی و یەکێک لـە کۆنـەپەرسترین و درندەترین ڕێژیمـەکـانی سـەر بـە ئیمپریـالیزمی لـە ڕۆژ هـەڵاتـــی نێوەڕاسـت دا تـێکەوە پێچـا. ئـەو سـەرکەوتنە ئـەگـەر بـۆ خـەڵکـی ئێـران مـایەی جـەژن وشـــادمـانی بـــوو بـــۆ بـەرێـــوەبـەرانی دەزگـــای بکرێگیـراوی بنـەمـاڵە زەبرەیـەکـی گرچـوو بـڕ و دڵ تـەزێـن بوو. چونکە ئـەوانە هیچ پێوەنـدیەکی دۆستـانـەیان لـەگەڵ گەلانی ئێران دا نـەبوو. و جـارێ نـەشیان توانیبـوو لـەگەڵ کاربـەدەســـتانی تـــازە بەســـەرداکەوتووی حکـــومـەتی خومـەینی ڕێک کـەون. شـەپوولی قین و تووڕەیی و ناڕەزایی بـەرامـبـەر بـە قیـادەی موقـت سـەرتاپای ئێرانـــی داگرتبوو زۆربـەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان و سـەرتاسـەری ئێـران داوایـان دەکـرد تـەواوی ئـەفـرادی قیـادەی موقـت لـە ئێـران دەربکـرێن. سـەر بـەنـد و بـن بـەنـدی هـەمـوو بـاس و خواسێکی سیاسی دەهـاتـەوە سـەر قیـادە و ئـەو تـاقمـەیـان لـە زۆربـەی جینـایـەتـەکـانی کـۆن و تـازەی کاربـەدەسـتـانی ئێـــران دەرهـەق بـە کـــۆمـەڵانی خـەڵـــک دا بـە بـەشـــداری دەزانی.

ئـەگـەرچـی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان زیـاتر لـە تـەواوی ڕێکخراوە ئێرانییەکان شارەزای ئاکـار و کـردەوەی دژی گـەلی سەرۆکایـەتی ئـەو تـاقمـە بـوو هـەرچـەنـد حیزبـی ئێمە پتر لـە هـەمـووان کـوتـەکی خۆفرۆشـی و بـەکرێگیـراوی

ئەوانەی کەوتبــوو بەڵام لەبەر هەســتی مەســئوولیەت بەرامبەر بە چارەنووســی گەلــی کــورد و هەزاران مــاڵی لێقەومــاوی کــوردی عێراقـــی کە لەئێـــران دا ئـــاوارە و سەرگەردان بوون هیچ کاتێک فکری تۆڵە ئەستاندنەوەی نەبــوو هەمــوو کاتێــک لەو بــاوەڕەدا بــوو کە پاداشـــی جینـایەت و خیـانەتی ئەو تـاقمە دەبــێ بەڕەفتـاری بـاش لەگەڵ کــوردە عێراقـــی یە دەربەدەرەکــان بــداتەوە. هەر بۆیەش لـە هەموو جێگـایەک دژی ئەو داوایە راوەستا کە کوردە پەنابەرە عێراقی یەکان لە ئێران دەربکرێن.

بەدوای ســەرکەوتنی شــۆڕش دا کاتێــک نــوێنەرانی دەوڵەتی کاتیی موهەندیش بازرگان هاتنە مەهاباد تـاقە نوێنەری حیزبــی ئـێمە لەو کۆبـوونەوەدا زۆر دژی بەنـدی هشتی داخوازەکان بـوو کە داوای دەکـرد ئەفرادی قیـادەی موقـــت لە ئێـــران دەربکـــرێن. دوایـــیش کە ئەو بەنــــدە بەزۆربەی دەنگ پەسەند کـرا حیزبــی ئـێمە چەندین جـار بەڕسمی ئەو داخوازەی بە شتێکی غەیرە مەسئوولی دانـاو رەتـــی کـــردەوە. کــۆمەڵانی خەڵکـــی کوردســـتانی ئێـــران شاهیدێکی زیندوون کە حیزبی ئێمە لەسەر ئەو سیاسەتە چەندی قسە پــێ گـوترا و چۆن لەلایەن زۆربـەی رێکخـراوە سیاســی یەکــانی ئێـرانەوە پەلامـاری تونـدی تەبلیغـاتی کرایە سەر.

بەڵام حیزبی ئێمە دیسان لەسەر ئەو سیاسەتە مەسئوولانەیەی خۆی ڕۆیشت و ئەوەندەی لە تواناشی دا هەبوو خەڵکی کوردستانی ئێرانی بۆ کۆمەک بە پەنابەرانی کوردی عێراق هان دا. هەزاران ماڵی عێراقی کە لە ناوچەکانی دوور دەستی ئێران سەرگەردان بوون بە موافەقەتی حیزبی ئێمە گەڕانەوە کوردستان و بە تەشویقی ئێمە لە کوردستان دا جێگا و ڕێگایان بۆ دابین کرا و حاوانەوە.

لە کۆنفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوێنەری زۆر لە حیزب و ڕێکخراوە سیاسی یە ناوچەیی و سەرتاسەری یەکانی ئێرانی تێدا بوو تەنیا ڕێکخراوێک کە دژی هێرش کردن بۆ سەر قیادە موقت راوەستا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو. لە بریارنامەی کۆنفرانس دا بە زۆربەی دەنگ بڕیارێک لە دژی قیادەی موقت پەسەند کرا بەڵام هەر لەوێ دا بە سەراحەت گوتراوە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران موخالیف بووە.بە کورتی لەگەڵ ئەوەی زۆربەی هێزە سیاسی یەکانی ئێران و بە تایبەتی کوردستان بە توندی لە دژی قیادە موقت کاریان دەکرد حیزبی ئێمە هیچ وەخت هەڵوێستی دوژمنانەی بەرامبەریان نەگرت و هەر لەو باوەڕەدا بوو کە ئەوانە وەک میوانێک دەبێ چاویان لێ بکرێ و بە پێی توانا یارمەتی خێزانە لیقەوماوەکانیان بدرێ.

بەڵام هەڵوێستی قیادە بەرامبەر بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و بزوتنەوەی کوردی ئێران چ بووە؟ لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران هەتا ئێستا سیاسەت و هەڵوێستی ڕێبەرایەتی پارتی واتە قیادە موقت بەرامبەر بەگەلی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستان هەمیشە ئەوە بووە کە هەر کاتێک هەستیان کردوە بزوتنەوەی گەلی کوردی ئێران لە پێشکەوتن دایە و ئەوان گەلەکەیان ناسکە کەوتوونە زمانی لووسی و ریاکاری و هەر وەختێکیش هەستیان کردبێ بۆ خۆیان بە هێزن و بزوتنەوەی کوردی ئێران لەپاشەکشەدایە. هێرشیان کردوە و دوژمنانە بزووتونەوە. لە ڕۆژەکانی پاش سەرکەوتنی شۆڕش دا ئەو کاتە کە وەزعیان زۆر پرزە بوو و جارێ ئاغای تازەیان ڕووی خۆشی پێیان نەدا بوون موراجەعەی حیزبی ئێمەیان کرد و ئامادەیی خۆیان بۆ هەر چەشنە هاوکارییەک نیشان دا. بەڵێنی شەرەف!! یان دا کە لە کاروباری نێو خۆی ئێران دا بە هیچ جۆر دەخالەت نەکەن و تەنانەت وایان نواند کە بێ پرس و ڕا و موافەقەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان قامک لەو ئاو ڕۆناکەن و هەرچی حیزب بۆیان دابنێ لە قسەی دەرناچن. کەچی لە شەڕی سێ مانگەی ساڵی ١٣٥٨ دا کە بە خەیاڵی خۆیان حیزبی ئێمەیان زەعیف هاتەبەر چاوو پێ یان وابوو گەلی کورد لە بەرامبەر هێرشی کۆنەپەرستی ئێران دا خۆی پێ ڕاناگیرێ هەرچی لە

دەستیان هات دژی بزوتنەوەی گەلی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستان کردیان. هەر لە سەرەتای هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی سێ مانگەدا کاتێک کۆنەپەرستان لە پاوە شەڕیان بە گەلی کورد فرۆشت حیزبی ئێمە قافیلەیەکی کۆمەک و تەقەمەنی بەرەو ناوچەی هەورامان وەرێ خست. بەڵام چەکدارەکانی قیادە لە دزلی پێشیان پێ گرتن و بەهیچ جۆر رێگایان نەدان برۆن. لە ئاکام دا پێشمەرگەکانی کورد لە ناوچەی پاوە لەبەر نەبوونی ئازووقە و تەقەمەنی ناچار بوون پاشەکشە بکەن وبەو جۆرە پێشی بەرەگرتنی هێرشی کۆنەپەرستی بەرەڵلا بوو. ئەگەر ئەو خەیانەتەی قیادە موقت نەبایە و شۆڕشگێرانی کورد لە پاوە لەوەختی خۆی دا کۆمەک و موهیماتیان پێ بگەیشتایە بەبێ شک چارەنووسی شەڕی کوردستان جۆرێکی دیکە دەبوو.

کاتێک هێرشی دووژمن بە بەربڵاوی لەهەموو ناوچەکان دا دەست پێ کرا لە ناوچەکانی شنۆ نەغەدە و پیرانشار پێشمەرگەکانی ئێمە ناچار بوون هێندێ بنکەی خۆیان لە سەر جادەکان چۆڵ بکەن کەچی چەکدارەکانی قیادە موقت کە هەمیشە لە پێشەوەی هێزە سەرکوت کەرەکانەوە دەڕۆیشتن بێشەرمانە تەواوی ئەو جێگایانەیان گرتەوە و تەنانەت ئازووقەی پێشمەرگەکانیشیان بەتاڵان برد.

وەختێـک شـاری شـنۆ کەوتە ژێـر دەسـەڵاتی ئەوان خەڵکـی بەشـەرەف و قارەمـانی شـنۆیە خۆپیشـاندانێکی ئارامیان ساز کرد. بەڵام خۆفرۆشانی قیادە تەقەیان لەو خەڵکە بێ دیفاعە کرد شەش کەسیان لێ کوشتن و یازدە کەسیان لێ بریندار کردن.

جگە لەو دوژمنایەتییە ڕاستەوخۆیە و سەرباری ئەوەی بۆ خۆیان هەمیشە شوێنە ستراتیژییەکانیان بۆ دوژمن دەگـرت لە نـاوچەی ورمـێ دەسـتیان کـرد بە دەلاڵـی و گەڕان بە نێو سـەرۆک عەشیرەتەکانی ئەو ناوچەیە دا. لە ئەنجام دا بەشێکی زۆر لەو سەرۆک عەشیرەتانەیان هەڵفریواند و چەکی خیانەتیان دانە دەست و کردیانن بە جاش.

بەرامـبەر بەو خـۆش خـزمەتییە کۆنەپەرستی ئێـران ڕووی مەرحەمەتـی تـێ کـردن و مـانگی دەمیلیون تمەنـی جاشانەی بۆ بڕینەوە کە پوولی شـەش مانگ واتە شەست ملیۆن تمەنـی بە ئاگـادرای و لە پێش چاوی ئەفسـەرێکی ئەندامی حیزبی ئێمە لە ژانـدەرمەری کوللی کیشوەر بە نەقدی تەسلیمی دەستی جەنـابی ئیدریس بـارزانی کورد پەروەر!! کرد.

لە پـایزی سـاڵی ١٣٥٨ دا کاتێـک کۆنەپەرسـتی ئێـران لەبەرامـبەر قارەمـانەتی و فیـداکاری گەلـی کـورد دا بە چـۆک داهـات دیسـان قیـادەی موقـت دەنـدەی گـۆڕی و بە

رواڵەت هەڵوێستی دۆستانەی گرتە پێش. دیسان وایان نیشان دا کە دەست لە کاروباری نێو خۆی ئێران وەرنادەن و بە پێچەوانەی قازانجی کوردی ئێران ناجوڵێنەوە. لە پاش تازەبوونەوەی شەڕ لە بەهاری ساڵی ۱۳۵۹ دا لە پێشدا سیاسەتیان دۆستانە بوو. بەڵام دوایە کە بە خەیاڵی خۆیان حیزبی ئێمە زەعیف بوو کەوتنە دوژمنایەتی.

لە خەزەڵوەری ساڵی ۱۳۵۹ دا چەکدارەکانی قیادە موقت لە ناوچەی مەریوان بە ناوی ئەوە کە دەیانەوێ بچنەوە دیو لەشکر و موهیماتێکی زۆر بەرەو دزڵی وەڕێ دەخەن. پێشمەرگەکانی حیزبیش بە پێی سیاسەتی گشتی حیزب کە قەت نەیویستوە لەگەڵ کوردەکانی دەرەوەی ئێران سیاسەتی دوژمنانەی هەبێ پێشیان ناگرن. بەڵام بەکرێگیراوانی قیادە زۆر بەنامەردانەوە بنکەی پێشمەرگەکانی حیزب لە دزڵی بەر دەسڕێژی موسەلسەل و ئاگر خومپارە دەدەن.

لە ئاکام دا زیاتر لە ۱۵ پێشمەرگەی ئێمە شەهید و بریندار دەکەن و ڕێگای ئیستراتیژیکی دزڵی دەگرنەوە و دوو دەستەکی تەسلیمی پاسدارانی دەکەن. بەو جۆرە بنەماڵەی بارزانی ئەوەندەی لە توانایان دا بووە لە دەستیان هاتوە لە هەموو دەرفەتێک بۆ زەربەوەشاندن لە بزوتنەوەی بەرهەقی گەلی کورد کەڵکیان وەرگرتوە. بزوتنەوەی کوردی عێراقیان بەو ڕۆژە گەیاند کە دیمان و ئێستاش دەیانەوێ بزوتنەوەی کوردی ئێران تووشی وەها

چارەنوسێک بکەن.

لە باری سیاسیشەوە بنەماڵەی بارزانی و بەناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق هەرچی بۆیان کراوە دوژمنایەتی ئێمەیان کردوە. زستانی ڕابردوو کاتێک کە خۆ فرۆشی بەزیو ڕەحمانی کەریمی پیلانی لە دژی حیزبی ئێمە گێڕا و ویستی پێشمەرگەکانی ئێمە تەسلیمی دوژمنی کورد بکا بەڕێوەبەرانی ئەو تاقمە خۆفرۆشە لەسەرەتاوە تا ئاخر هاودەستییان لەگەڵی کرد و پاشانیش کە پیلانی خائینانەی کەریمی بە وشیاری خەڵکی قارەمانی کوردستان پوچەڵ کرایەوە ناوبراو پەنای بۆ مۆڵگەی جاشەتی ئەوان برد و قیادەش بە گەرمی باوەشی بۆ کردەوە و پەنای دا. کاتێکیش کە حیزبی ئێمە بە نامەیەکی ڕەسمی ڕەخنەی لەو کردەوەیان گرت لە وەڵام دا نووسیان کە ئێمە کەریمی بە خائین نازانین و بە ئینسانێکی دڵسۆزی دەناسین. دیارە لە قامووسی ئەوانەدا هەر کەس لە دژی قازانجی گەلی کورد هەنگاوێک هەڵێنێ دڵسۆز و نیشتمانپەروەرە و بە شەرەفە!! ماشەللا و هەزار ماشەللا.

ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە بنەماڵەی بارزانی چیان لە گیانی خەڵکی کوردستانی ئێران دەوێ؟ بۆچی لە ئێرانن و نەخشەیان بۆ دوا ڕۆژ چیە؟ ئەو خائین و خۆفرۆش لەبەیاننامە و نووسراوەکانی خۆیان دا وانیشان دەدەن کە گۆیا ئەوان بۆ خودموختاری کوردستانی عێراق

تێدەکۆشن و گۆیا ئێمە ڕێگایان نادەین بچنە عێراق. لەکاتێک دا بە پێچەوانەی ڕەفتاری ئەوان کە نەیاندەهێشت ژن و منالّی برایانی ئاوارەی ئێمەش لەناوچەکانی سنووری ئێران دابنیشێ ئێمە هەمیشە گوتوومانە کە دەتوانن بچنەوە خاکی خۆیان و لەوێ دا بمیننەوە و لە خاکی کوردستانی عێراق هەر چی بکەن ئازادن و بە ئێمەش مەربووت نییە. بە شاهیدی دۆست و دوژمن پار کە ئەوان داوایان کرد ڕێگایان بدەین بچنەوە عێراق و گویا لەوی بمێننەوە. ئێمە نەک هەر ڕێگامان دان بەڵکوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسی یەکانی کوردستانی عێراق تووشی کێشە نەبن بە پێشمەرگەی خۆمان ئیسکورتمان کردن تا گەیشتنەوە خاکی عێراق. کەچی قەت مانگێکی پێوە نەخرا کە بەغاردان هەڵاتنەوەو خۆیان لە جاشخانەکانی ئێران هاوێشتەوە.

باشە پرسیارەکەمان دووبارە دەکەینەوە: ئەوانە بۆ لە ئێرانن؟بۆچی شەڕ بە کوردی ئێران دەفرۆشن؟ ئەم دواییانە ئیدریس بارزانی لە کووبوونەوەیەکی جاشەکانی شیمال دا گوتوویەتی تەنیا بنەماڵەی بارزانی حەقیان هەیە داوای خودموختاری بۆ کورد بکەن. هەر حیزبێک لە هەر بەشێکی کوردستان دا داوای خودموختاری بکا ئێمە لێی قبوڵ ناکەین. دیارە کەس هەقی ئەو کوێخایەتییەی بە نۆکەرانی گوێ

لە مستی سیای ئەمریکا و موسادی ئیسرائیل نەداوە. بەڵام ئەگەر ڕاست دەکەن و بۆ خۆیان پێیان وایە بۆ هەقی کورد تێدەکۆشن بۆچی ناچنەوە وڵاتی خۆیان لە کوردستانی عێراق خودموختاری دابین بکەن؟ ئەو هەموو ناوچە بەتاڵەی سنووری کوردستانی عێراق هەیە بۆچی بنکەیەکیان لێ نەکردوەتەوە؟ داخوا بە کوشتنی ژن و منداڵ و پیر و پاتاڵی کوردستانی ئێران خودموختاری بۆ کوردی عێراق وەردەگیرێ؟

بەڕێوەبەرانی بەناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ئێستا بە نرخێکی هەرزان خۆیان بە ڕیژێمێک فرۆشتوە کە نەک هەر خودموختاری کوردستان بە ڕەسمی ناناسێ بەڵکوو لەبنەڕەت دا هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری بە کفر و بەپێچەوانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەزانێ. ئەو تاقمە ئێستا لەگەڵ کۆنەپەرستترین جاش و سەرۆک عەشیرەتەکانی دیکە یەکیان گرتوە ئەوانە بوونە هاوپالەی کەسانێک کە خوێنی هەزاران کوردی هەژاریان رشتوە و هەزاران بنەماڵەی جوتیاریان لەسەر جێگا و ڕێگای خۆیان هەڵکەندوە.

بێشەرمی ئەو خۆفرۆشانە گەیشتوەتە ڕادەیەک کە لەکاتی هێرش کردن بۆ سەر ناوچە ڕزگار کراوەکان بە سەرۆک جاشەکانیان گوتوە ئێوە تەنیا مەسئوولیەتەکەی وەئەستۆ بگرن با شتەکە بەناوی ئێوە بێ. ئەگینا شەڕەکە ئێمە دەیکەین و بۆ خۆمان بەرەنگاری

پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەبینەوە ئێستا بۆ هەموو گەلی کورد و بەتایبەتی کوردی عێراق هەیە کە لەو خۆ فرۆشانە بپرسێ بەو کارە دەیانەوێ کوردی عێراق ڕزگار بکەن یان خودموختاری بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان وەربگرن؟ بەڵام کەسیش نابێ چاوەڕوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بێ. چونکە وەڵامەکەی لەلای ئەوان نیە. ئەوان لەسەرەوەڕا دەستووریان پێ دراوە و ئەوە دەزگاری جاسوسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە دەتوانێ هۆی کردەوەی خەیانەتکارانەی قیادە ڕوون بکاتەوە.

پێش ئەوەی بێینە سەر ئەو باسە پێویستە بگوترێ دووساڵ و نیو پێش ئێستا کاتێک مەلا مستەفا بارزانی لە ئەمریکا و لە ماڵی دۆستە خۆشەویستەکانی مرد. لەگەڵ ئەوەی وەک لە پێشەوە باسمان کرد لە ئێران و بە تایبەتی لە کوردستان دا بیروباوەڕی دژی پارتی زۆر بە هێز بوو حیزبی ئێمە موافەقەتی کرد کە جەنازەی بارزانی بێتەوە شنۆیە بە خاک بسپێردرێ. لە ڕۆژی ناشتنی تەرمی بارزانیش دا خەڵکی بەشەرەفی شنۆیە زۆر پیاوانە میوانداری دەیان هەزارکوردی عێراقی و ئێرانییان کرد کە هاتبوونە سەر قەبران. ئەندامانی حیزبی ئێمەش هەمو جۆرە خزمەت و هاوکارییەکیان بۆ ناشتنی تەرمی بارزانی بەکار هێنا.

دیارە بۆ ئێمە تا ئێستاش ڕوون نەبوو کاتێک بارزانی کە لە ئەمریکا مردوە و حکوومەتی عێراقیش بە ڕەسمی ڕێگای داوە بیبەنەوە لە عێراق بینێژن چونکە کە لە نێو ئەو جێگایەی لێ مردوە و ئەو جێگایەی لە دایک بووە جێگایەک و وڵاتێکی دیکە بۆ ناشتنی تەرمەکەی هەڵدەبژێرن. ئەگەر مەبست ئەوەبێ کە گویا وەختێک بیبەنەوە عێراق خۆ ئەگەر لە ئەمریکاش نێژرابایە ئیمکانی ئەو کارە هەر هەبوو. کێ دەزانێ داردەستەی بارزانی هەر ئەو دەم بۆیە تەرمی بارزانییان نەهێناوەتەوە ئێران کەلە ڕۆژێکی پێویست دا

شانۆسازییەکی وەک ئەمساڵ بکەن و بیکەنە بیانووی پەلامار بۆ سەر خەڵکی کوردستانی ئێران . لەوانەشە ئەو وەخت شتی وایان بە نیازدا نەهاتبێ بەڵام تازە دەستیان لەوە هەڵگرتبێ جارێکی دیکە بچنەوە عێراق و بۆیە بیانەوێ گڵکۆی بارزانی لە نزیک خۆیان بێ و هەر وەختیش ویستیان بە هۆی ئەوەوە پەنابەرەکانی کوردی عێراق لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە.

بەهەر حاڵ با بێینە سەر باسەکە.رۆژی دەی پووشپەڕی ئەم ساڵ لە شنۆوە خەبەر بە بەڕێوەبەرایەتی حیزبی ئێمە گەیشت کە تاقمێکی خۆ فرۆش و خوانەناس بەشەو گڵکۆی مەلا مستەفا بارزانییان داوەتەوە تەرمەکەیان دزیوە. بەڕێوەبەرایەتی حیزبی ئێمە زۆر بەو خەبەرە ناڕەحەت بوو و بەڕەسمی لە دەنگی کوردستانی ئێرانەوە ئەو تاوانەی وەک کردەوەیەکی دژی ئینسانی و دژی ئیسلامی مەحکووم کرد. بەخۆشییەوە هەر ئەو رۆژە خەبەر گەیشت کە تەرمەکە دۆزراوەتەوە و بە حورمەتەوە تەسلیمی بنەماڵەکەیان کراوەتەوە. دیسانیش کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری دا کە لەو کارەساتە بکۆڵێتەوە و تێ بکۆشێ ئەو تاوانبارانە بدۆزێتەوە بە سزای خۆیان بگەیەنێ. لەو بارەوە ڕێنوێنی و دەستووری پێویست بە کۆمیتەی شارستانی حیزب لە ناوچەی شنۆیەش درا. بەڵام زۆر بەسەرسوڕمانەوە دیتمان دارودەستەی پارتی و لە سەرووی هەموویانەوە مەسعود

بارزانی کە گویا سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە زۆر پێتانە و بێشەرمانە دەستیان کرد بە بەیاننامە دەرکردن و درۆ و بوختان هەڵبەستن بۆ حیزبی ئێمە کە گویا دزرانی تەرمی بارزانی بە ئاگاداری و دەستووری حیزبی دیموکراتی کوردستان بووە. هەر بە دوای ئەو درۆ و دەلەسەیەش بە ڕەسمی هەڕەشەیان کرد کە ئەو کارە بێ سزا ناچێ و یان روحیان لەبەر دانابێ یان قینی دڵیان بە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەڕێژن. رادیۆ شڕەکەشیان کە بە ئیمکانی ڕیژێمی کۆنەپەرستی خومەینی لە مەرگەوەری ناوچەی ورمێ دامەزراوە لێکدا لێکدا دەستی کرد بەبڵاو کردنەوەی تۆمەت و بوختانی بێشەرمانە لە دژی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بزوتنەوەی میللی دیموکراتیکی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران.

تەنیا جوابی ئێمە بۆ ئەو هەمو درۆ و دەلەسەیەی بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزم ئەوەندە بوو کە لە ڕادیۆی دەنگی کوردستانەوە ڕامان گەیاند ئێمە دەرهێنانی تەرمی بارزانی جارێکی دیکە مەحکووم دەکەین و بە هەموو توانامانەوە بۆ دۆزینەوەی تاوانبارەکان تێدەکۆشین. بەڵام ئەگەر هێندێک کەس بیانەوێ ئەو ڕووداوە بکەنە بیانوو بۆ ئاژاوە نانەوە لە ناوچەی شنۆ و ورمێ دەبێ بزانن کە لەگەڵ هێزی یەکگرتووی شەش ملیۆن کوردی ئێرانی بەرەو ڕوو دەبن.

پاش نێو بژی کردنی هێندێک لە هێزە سیاسییەکانی کوردستان لە سەر داواو و پێشنیاری ماڵی بارزانی بڕیار درا کۆمیسیۆنێکی هاوبەش لە نوێنەرانی حیزبی ئێمە و پارتی و ئەو هێزە کوردستانییانە بۆ لێکۆڵینەوە لەو کارەساتە پێک بێ. کەچی کاتێک ئەو کۆمسیۆنە لە شنۆیە کۆبووەوە ، هیچ نوێنەرێک لەلایەن پارتییەوە نەهات. کاتێک نوێنەرانی حیزبی ئێمە هۆی نەهاتنەکەی پرسیبوو برایانی کوردستانی گوتبوویان کە پارتی پێی باش بوە ئەمجارە تەنیا ئێمە بێین و بۆ جاری دووهەم ئەوانیش نوێنەری خۆیان بنێرن.

هەر ئەو دەم نوێنەری حیزبی ئێمە بە نوێنەری کوردستانییەکانی گوتبوو کە ئەو هەڕەشە و گوڕەشەی بارزانییەکان دەیکەن و ئەوە کە حازر نین بێنە لای ئێمە و لە کۆمسیۆن دا بەشداربن ئەو فکرە بۆ ئێمە دێنێتە پێش کە ئەو کارە بەدەستی خۆیان کراوە. چونکە ئێمە ئەگەر بمانەوێ شەڕ بە پارتی بفرۆشین پێویستمان بەو جۆرە کارە دژی ئینسانییانە نیە. ئەوان زۆر تاوانیان دەرهەقی ئێمە کردووە کە ئەگەر بمانەویستایە شەڕیان لەگەڵ بکەین دەبوو لەسەریان وەدەنگ بێین. بەڵام وادیارە ئەوان دەیانەوێ شەڕێک بە ئێمە بفرۆشن و ئەو شانۆیەشیان بۆ ساز کردوە کە هەستی هێندێ لە برا کوردە عێراقی یەکان لە دژی ئێمە هان بدەن. پاشان نوێنەرانی هێزە کوردستانییەکان گوتبوویان کە ئێستا

پارتی ئەو توند و تیژی یەی نەماوە و زیاتر بە شێوەیەکی سیاسی و ئووسوولی بۆ مەسەلەکە دەچێ و لەوانەشە بۆ جاری دووهەم حەتمەن نوێنەری خۆی بنێرێ. هەڵبەتە ئێمە زۆرمان پێ خۆش بوو کە پارتی ڕێگای ئەقڵ و مەنتیقی گرتبێ و ئامادە بێ پێکەوە تاوانبارانی ئەو کارەساتە بدۆزینەوە. کەچی بەداخەوە دەرکەوت کە بەو جۆرە ویستویانە براکانی نوێنەری هێزە سیاسی یەکانی کوردستانیش فریو بدەن و لەبن پەردەوە خۆیان بۆ پیلانی شەیتانی خۆیان ئامادە بکەن.

لێکۆڵینەوە لەمەسەلەی دزرانی جەنازەی بارزانی هێندێک شتی سەرنج راکێشی خستە ڕوو جارێ تەرمی بارزانی تەنیا بیست میتر دوورتر لە قەبرەکەی بە ساغ و سڵامەتی دۆزرابۆوە. ئەمجار دەرکەوت کابرایەک بە ناوی ڕحیم میران کە لەلایەنماڵی بارزانەوە ئاگاداری گۆڕستانەکەی پێ سپێراوە سێ چوار مانگ بووە بەو نێوەدا نەهاتوە. تەنیا ڕۆژی پێش ئەو ڕووداوە پەیدابووە و پیاوێکی بەکرێ گرتوە کە سبەینێ بێ گیای سەر گۆڕی بارزانی بدروێ. بۆ بەیانیش پێش دنیا ڕووناک بوون هەر ئەو کابرایە چوتە لای باوکی کرێکارەکە و گوتوویە با کورەکەت نەیە چونکە جەنازەی بارزانی دزراوە. دوای ئەو شانۆسازی یە ڕەحیم میران چۆتە مەرگەوەڕو خەبەری بە بارزانییەکان داوە. بەڵام لە ڕێگا تووشی هەرکەس بووە گوتویە دەچمە ورمێ و کاتێک هاتوتەوە

شنۆیش وای نیشان داوە کە ئاگای لە دزرانی تەرمی بارزانی نیە. پاشانیش هەڵاتوە و چوتە لاس مەسعود بارزانی و ئێستاش کە ئێستایە لە باوەشی خۆیان گرتوە نەیان هێشتوە بێتەوە شنۆیە کە تەحقیقی لێ بکرێ. بەڵام ڕووداوەکانی دواتر هێندێ شتی تازەشیان دەرخست. جارێ دەرکەوت کە کوڕانی بارزانی بۆ بردنە پێشی پیلانی دژی گەلی خۆیان زۆریان لەو ڕووداوە کەڵکی خراپ وەرگرتوە. ئەوان هێندێ لە کوردە پەنابەرە عێراقییەکانیان بەو جۆرە لە دەوری خۆیان کۆکردوەتەوە و لەدژی خەڵکی کوردستانی ئێران و بە تایبەتی حیزبی ئێمە هانیان داون. جگە لەوەش سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی دەورو پشتی ورمێ خائین و خۆفرۆشەکانی تاقمی بەکرێگیراوی حەوت کەسیشیان لە خۆیان هاڵاندوە و هەموویان پێکەوە نەخشەی هێرش بۆ سەر ناوچەکانی مەرگەوەر و تەرگەوەرە و دە.... و شنۆیان کێشاوە. ئەوە بوو کە بەکەڵک وەرگرتن لە دڵپاکی ئێمە و بە ئاگاداری لەو ڕاستی یە کە پێشمەرگە خۆی بۆ شەڕێکی وا ئامادە نەکردوە پێش جاش و پاسدار و ئەرتەشی ئێران و بە کوشتدانی دەیان کەس لە کوردە هەڵخەڵەتاوەکانی عێراق لە پشتەوە خەنجەریان لە گەلی کورددا. ناوچەی مەرگەوەر و شنۆیان لەدەستی پێشمەرگە دەرهێنا و دایانە دەستی دوژمنی فاشیست و کۆنەپەرستی گەلی کورد.

بەڵام دوای ئەو خیـــانەتەی پـــارتی لە هێنـــدێک سەرچاوەی باوەڕپێکراوی نێو خۆیانەوە چەند گۆشەیەکی دیکەی مەسەلەکەش ڕوون بوونەوە. دەرکەوت کە هەشت مانگ بووە ڕیژێمی خومەینی جاشانەکەی نەداوە بە پارتی. بەڵام بە دەست خۆشانەی ئەو خیانەتە بێجگە لە چەک و تەقەمەنی جاشانەی هەشت مانگیان لەسەریەک دانێ. کە ئەگەر زیادی نەکردبێ، دەکاتە هەشتا میلیون تمەن. لەخوای بە زیاد بێ، بۆ کەسانێک کە دین و ئیمان و گەل و نیشتمانیان بە پوول فروشتووە هەشتا میلیۆن تمەن گاڵتەی پێ ناکرێ.

جگە لەوە ئیسپات بووە کە ئەمانە لەسەر دووپەت یاری دەکەن ئێستا کە سەڵتەنەت خوازن لە تورکیەوە دەیانەوێ بێنەوە ئێران دارودەستەی پارتی لە گەڵیان ڕێک کەوتوون کە بە یارمەتی ئەفسەرانی شا دۆستی نێو ئەرتەشی حکوومەتی ئاخوندی ناوچەی ورمێیان بۆ پاک بکەنەوە بەو شەرتە کاتێک گەڕانەوە ئێران و دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت جاشانەی ئەوان مەحفووز بێ. کەوابوو شانۆسازی دەرهێنانی تەرمی بارزانیش هەر لە خزمەتی ئەو ئامانجە شەیتانییەدابووە و هەر بەدەستی چەپەلی داروده‌ســـتەی پـــارتی جـــێ بە جـــێ کـــراوە.

لە کۆتای دا دەمانەوێ دوو مەسەلە بخەینە بەرچاوانی ئەو کوردە پەنابەرە عێراقی یانە کە هێشتا هەستی پاکی کوردایەتی و نیشتمانپەروەرییان تێدا بە هێزە و

بـێ ئەوەی بـۆ خۆیـان بـزانن کەوتـوونە دوای ئەو تـاقمە خـۆفرۆش و بـەکرێگیـراوە. یەکەم ئەو خوشـک و برایـانـەی دەزانن کە کـاتی خۆی لقـی یەکـی پـارتی لـە دهـۆک، لقـی دوو لـە هەولێـر، لقـی سـێ لـە کەرکـوک، لقـی چـوار لـە سولـەیمانـی و لقی پێنجیش لـە بـەغدا بوو. کەچی ئێستا بۆ خۆیان دەبینن کە مـەرکـەزی ئەو لقانـەی پـارتی کەوتـوەتـە پیرانشـــار و مەرگەوەر و کەرەج و شـــوێنەکانی دیـــکەی ئێران. سەرکردە خۆفرۆشەکانیان بـەو پەڕی بێ شەرمیەوە تابلۆی زەلام و قەبەشیان لـە بـەر دەرکـی ئـەو نـاو لقـانـەی پـــارتـی هەڵاوەســیوە. داخـــوا خوشـــک و بـــرا کـــوردە عێراقییەکـان هـیچ بیریـان لـەوە کـردوەتـەوە کە ئـەو کـارە مانـــای ئەوەیە بنەمـــاڵەی بـــارزانی بە یەکجـــاری خواحافیزییـان لـە عێـراق کـردوە و دەیـانـەوێ بـۆ هـەمیشـە لـە ئێران بمێننەوە. ئەویتر نـەک بـۆ کـوردایـەتی بـەڵکو بـۆ خیـانـەت و جاشـەتی؟. دووهـەم ئەوەیە کە هەرچـەنـد ئـەو خۆفرۆشـانـە بەکەڵـک وەرگـرتن لە نیـاز پـاکی حیـزب و پێشـمـەرگە توانیویـانـە هێنـدێ جیگـا داگیـر بـکـەن بـەڵام گەلی شـەش میلیـون کـوردی ئێـران هـەرگیـز ئـەو خیـانـەتـە نابەخشـێ و لـە داهـاتوویەکی نزیـک دا خەیانـەتکـاران بە ســـــــــزای خۆیـــــــــــان دەگەیەنـــــــــــێ.
کەوابـێ باشـتر نـیە ئـەو کـوردە هەڵخەڵەتـاوانە پـێش ئـەوەی مۆری خیانـەتیان بە نێو چاوانـەوە بنووسـێ و پێش ئـەوەی دەستیان بە خـوێنی برایـانـی خۆیـان سـوور بـێ و

بەرلەوەی بە ئاگرێک کە سەرۆکە خۆفرۆشەکانیان هەڵیان گیرساندوە بسوتێن بەرگی جاشەتی و خیانەت فڕی دەن و بێنەوە باوەشی گەرمی میللەتی کورد جا چ لە عیراق چ لە ئێران؟.

هیوادارین هەم ئەو خوشک و برا کوردە عێراقیانە کە کەوتوونە دوای پارتی و هەم کۆمەڵانی بەشەرەفی کوردی عێراق بەگشتی جارێک بۆ هەمیشە جەوهەری خۆفرۆشانەی دارودەستی پارتی بناسن و مۆری جاشەتی و خیانەتیان بە نێوچاوانەوە بنێن بە هیوای سەرکەوتنی بزوتنەوەی هەقخوازانەی گەلی کورد و ڕووڕەش بوونی هەرچی زیاتری بەکرێگیراوان و خۆفرۆشان.

بۆ هەموو حیزب و ڕێکخراوە دیموکرات و پێشکەوتنخواز و دژی ئیمپیریالیستیەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سڵاوێکی گەرمی شۆڕشگێڕانەتان پێشکەش دەکا.

**هاوڕێیانی بەڕێز!**

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وەک بەکێک لە هێزەکانی دژی ئیمپریالیستی و دژی کۆنەپەرستی ناوچە، ماوەی ٣٦ ساڵە لە پێناوی ئازادی و دیموکراسی و بۆ وەدەست هێنانی مافی ڕەوا گەلی کورد لە کوردستانی ئێران خەبات دەکا. حیزبی ئێمە جووڵانەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بە بەشێک لە جوڵانەوەی دژی

ئیمپریالیستی و رزگاریخوازی گەلانی ئێران و هەموو ناوچەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست دادنێ و هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە پێویستە هێزەکانی شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز لە بەسەر هات و ڕووداوەکانی ناوچە یەکتر ئاگادار بکەن و لەسەر گیروگرفتەکان بیرو باوەڕ بگۆڕنەوە و لە چارەسەرکردنیان دا یارمەتی یەکتر بدەن.

هەر لە سەر ئەو ئەساسە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی ئێمە سەرنجی ئێوە بۆ هەلوێست و کردەوەی بنەماڵەی بارزانی رادەکێشی کەهەر ناوی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراقیان لەسەر ناوە.

ئیمە بە پێویستی نازانین لە بارەی ڕابردووی بەڕێوەبەرانی ئەم پارتییەو خەیانەتیان بە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستانی عێراق بدوێین. یان لە بارەی سەر بە ئیمپریالیزم بوونی سەرۆکایەتی بارزانی و کورەکانی شتێک بنووسین. چونکە پێمان وایە خەیانەتی ئەو تاقمە کە جووڵانەوەی نیشتمانی کوردستانی عێراقی فیدای قازانجی ڕیژێمی شاو ئیمپریالیزمی ئەمریکا کرد لە ڕۆژ ڕوونـاکترە. بەڵام ئێستا کە ئەم داروودەستەیە لە ڕابردوو دەرسیان وەرنەگرت و پاش بە فیرۆدانی خوێنی هەزاران ڕۆڵەی کوردی عێراق پێکەوە لەگەڵ ئەرتەش و پاسدارانی ڕیژێمی خوێنمژی خومەینی هێرشیان هێناوەتە سەر گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و هەتا ئێستا بەدەیان ژن و منداڵی بێ گوناهیان کوشتوە.

دەمانەوێ هێندێ مەسەلەتان بخەینە بەرچاو.

هەڵسورێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە لە ساڵەکانی ١٩٦٦- ١٩٧٥ و بە تایبەتی لە دوا ساڵەکانی بزوتنەوەی بارزانی دا بە ئاشکرا کەوتبونە بن باڵی "ساواک" و "موساد" و "سیا" بە دەستووری "شا" زۆر کەس لە ڕێبەران و ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان گرت و تەحویلی ساواکیان داوە کە لەدەست ڕیژێمی شا پانایان بۆ عێراق بردبوو. ئەمانە پاشان لە ئێران ئیعدام کران. هەروەها چەند کەس لە ڕێبەرانی حیزبی ئێمە لە عێراق کوشت و تەرمەکانیان بە ساواک فرۆشت.

هەر لە سەرەتاوە هەڵسوڕاوانی پارتی بەم شەرتەوە لەگەڵ ڕیژێمی شا ڕێک کەوتبوون کە نەهێڵن جووڵانەوەی دیموکراتی و نیشتمانی لە کوردستانی ئێران دا پەرە بسێنێ. لە ساڵەکانی ١٩٦٧-١٩٦٨ دا کاتێک خەباتی چەکدارانە دژی ڕیژێمی شا لە کوردستانی ئێران دەستی پێ کرا بارزانی جاشەکانی خۆی لە گەڵ ژاندارم و سەربازی ئێرانی وەدوای نیشتمان پەروەرانی کوردی ئێران خەست وتا سەرکوت کردنی ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانی کورد یارمەتی ڕیژێمی شای دا. لەو جەرەیانەدا بە دەیان ڕۆڵەی دیموکرات و شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێران بەدەستی چەکدارەکانی بارزانی و ژاندرمەکانی ئێران شەهید کران.

بەرامبەر بەو خەیانەت و جینایەتەی تاقمەکەی بارزانی نیسبەت بە کوردەکانی ئێران کاتێک لە ساڵی ١٩٧٥ بە هۆی خیانەتی بارزانی و گریدانی سیاسەتی خۆی بە قازانجی ئیمپریالیزمەوە جووڵانەوەی یازدە ساڵەی گەلی کورد لە کوردستانی عیراق تێک شکا و دەیان هەزار خاو خێزان دەربەدەر بوون و ڕوویان کردە کوردستانی ئێران گەلی کورد ئامێزی بۆ کردنەوە و بەدڵێکی ئاواڵەوە بە پیشوازیان چوو و پەنای دان و بەخێوی کردن.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ دا کوڕەکانی بارزانی کە قیادەی مووەقەتیان پێک هێنا بوو وایان نیشان دەدا کە لە کردەوەی خاینانەی پێشوویان پەشیمان بونەوە و دەیانەوێ لە ڕیزی جووڵانەوەی نەوەی کورد دا جێگایان بکرێتەوە داوایان لە حیزبی ئێمە کرد کە ڕێگا بدا بێنەوە کوردستانی ئێران و لەو دەربەدەری و پەرش و بڵاوییە ڕزگاریان بێ . حیزبی ئێمەش نەک هەر ڕیگای دا بوو یارمەتیشی دان.
هەڵسوڕێنەرانی قیادەی مووەقەت لە ماوەی ئەو ٣ ساڵەی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران نیشانیان داوە کە کاتێک خۆیان بە کز دەزانن دەکەونە پاڕانەوە کە دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و تەنانەت بە بێ دەستووری حیزبی ئێمە ناجوڵێنەوە، هەر بۆیەش زۆر جار لەسەر داوای خۆیان چاویان بە بەڕێوەبەرانی حیزبی

ئێمە کەوتوە و وەفاداری خۆیان بە حیزب و بەڕێوەبەری حیزب ڕاگەیاندوە.

بەڵام لە ساڵی ١٩٧٩ دا کاتێک ڕیژێمی خومەینی ئیعلانی جیهادی بە دژی خەڵکی کوردستانی ئێران دا و هەڵسوڕێنەرانی قیادەی مووەقەت و چەکدارەکانی داروودەستەی بارزانی واتێ گەیشتن کە حیزبی ئێمە کز بوە دەست بە جێ لە ناوچەی مەریوان شان بەشانی ژاندرمەکانی ئێران بە گژ پێشمەرگەکانی حیزبی ئێمەدا چوون، لە شنۆ تەقەیان لە خۆپیشاندانی خەڵک کرد و شەش کەسیان کوشت لە ناوچەی ورمێ دەرەبەگ و کۆنە ساواکیەکان بە پشتیوانی ئیدریس بارزانی نزیکەی هەزار ماڵی وەرزێر و زەحمەتکێشیان دەربەردەر کرد و هەر لە سەر پێشنیاری "ئیدریس" چەندین سەد نەفەر لەم ناوچەیەدا بە سەرۆکایەتی دەرەبەگەکان بوون بە جاشی ڕەسمی ڕیژێمی خومەینی.

کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران چەند جار ئەم کردەوە ناڵەبارانەی بە چاو هەڵسوڕێنەرانی قیادە مووەقەت دا داوە داوای لێ کردن کە واز لەم سیاسەتە چەوت و دژی گەلی یە بێنن و دەست لە کاروباری کوردستانی ئێران وەرنەدەن.

پاش سەرکەوتنی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە شەڕی ٣ مانگەی ساڵی ١٩٧٩ دا داروودەستەی قیادە مووەقەت دیسان جلی گورگی خوێنمژیان گۆڕیەوە و

خۆیـان کـردەوە بەرخـی بـێ گونـاه وپەنایـان بـۆ بەڕێـوەبەرانی حیزبـی ئـێمە هێنـا. حیزبـی دیمـوکراتی کوردستانیش لەسـەر ئەو ئەسڵە کە هەر نەبـێ هەزاران پەنابەری کوردی عێراقـی لە مەینـەت و کێشـە دەپارێزی، بۆ جارێ چەنـدەم تـۆبەی بەڕێـوەبرانـی قیادەی قەبـووڵ کرد.

بەڵام ئەو تـاقمە کە ٢٠ ساڵە بازرگـانی بە مەسـەلەی کـورد دەکەن و قـازانجی دوا ڕۆژی نەتەوەی زۆر لێکـراوی کوردیان لـە پێنـاوی مەسڵەحەتی خۆیان دانـاوە هەروەک بە ئەمـر و فەرمـانی خەبـات وتێکۆشـانی چەنـد سـاڵەی گەلـی کوردیـان لە کوردسـتانی عێـراق بە چەنـد دۆلار فرۆشت و خوێنی هەزاران کوردی بـە شەرەفیان بە فیـڕۆدا ئەمجارەش بەفەرمانی ڕیژێمـی خـومەینی شـان بە شـانی لەشـکر و پاسـدرای بە نـاو ئیسـلامی نـاوچەی شـیمالی کوردستانـی ئێرانیان خستوەتە بەر پەلامار و دەستیان بە کوشتاری خەڵکی بـێ دیفـاعی کـردوە. ئەوانە لە پشت ڕا خەنجەریـان لە پێشـمەرگەکانی کوردسـتان داوە. ئەوەش ڕاست لە کاتێک دا کە ڕیژێمی خوێنمژی خومەینی هەموو ڕۆژێک بە دەیان تێکۆشـەر و ئـازادیخوازی ئێرانـی بە بـێ دادگـا و موحـاکمە ئیعـدام دەکـا و بـۆ ئەنـدامان و لایەنگرانـی هێزەکـانی دژی ئیمپریالیسـتی قەسـابخانە دادەنێ. دارو دەستەی قیادەی مووەقەت هەر لەو کـاتەدا کە کوردسـتانی ئێـران دەخەنە بەر هێـرش و بە

جینایەتەکانی خۆیان ڕووی پاسدارانی خومەینی سپی دەکەنەوە کە چەندین"دێریاسین"یان لە کوردستانی ئێران پێک هیناوە هەر لەو کاتەش دا لەسەر ئەساسی پێوەندی نیچڕاوی خۆیان لەگەڵ"سیا"ی ئەمریکا هەوڵ دەدەن ڕێگا بۆ سەلتەنەت خوازانی هەڵاتوو لە شیمالی کوردستان خۆش بکەن و یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی ڕیژێمێکی بە تەواوی سەر بە ئەمریکا جارێکی دیکە بەسەر ئێران دا زاڵ بێتەوە. دیارە خەڵکی کوردستانی ئێران لە توانای دا هەیە ئەو تاقە بەکرێگیراوەی سەر بە ئیمپریالیزم سەرکوت بکا.

کەوابوو بێ گۆمان هەڵسوڕێنەرانی قیادەی مووەقەت بە توندی سزا دەدرێن و ئیجازەیان پێ نادرێ لە کوردستانی ئێران جێ گیر بن و بە خەیانەتی خۆیان درێژە بدەن. ئەم کارە هەر لە ئێستاوە دەستی پێ کردووە. کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ، ئێوە لە کردەوەی خاینانەی قیادەی مووەقەت لە ئێران ئاگادار بکا و ئەم تاقمە سەر بە ئیمپریالیزمەتان پێ بناسێنێ و داواتان لێ بکا کە بەرامبەر بە جینایەتی ئاشکرای دازودەستەی بارزانی هەڵوێستی پێویست بگرن.